5

# بازیان و چەمچەماڵ

## لە بەڵگەنامەکانی عوسمانی دا

١٢٩٨-١٣٣٦ کۆچی

١٨٨١-١٩١٨ زایینی

بەرگی پێنجەم

ئامادەکردن و پێشکەشکردنی:
دکتۆر نەوزاد یەحیا باجگر
وەرگێڕان: ئاشتی ڕەحمان

بازیان و چەمچەماڵ لە بەڵگەنامەکانی عوسمانی دا

CIHAN UNIVERSITY

ئامادەکردن و پێشکەشکردنی: دکتۆر نەوزاد یەحیا باجگر

2018

# بازیان و چەمچەماڵ

## لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا

١٢٩٨-١٣٣٦ کۆچی
١٨٨١-١٩١٨ زایینی



**بەرگی پێنجەم**




**بڵاوکراوەی زانکۆی جیهان**
**خانەی بەڵگەکان**
**٢٠١٨**

ئامادە و پێشکەشکردنی: **د. نەوزاد یەحیا باجگر**
وەرگێڕان: **ئاشتی رەحمان**




• ناوی کتێب • **بازیان و چەمچەماڵ** لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا

بەرگی پێنجەم ١٢٩٨ - ١٣٣٦ کۆچی/ ١٨٨١ - ١٩١٨ زایینی

• ئامادە و پێشکەشکردنی • د. نەوزاد یەحیا سەعید باجگر

• وەرگێڕان (زمانی عوسمانی) • ئاشتی ڕەحمان

• بەڕێوبەری هونەری • بورهان سابیر

• دیزاینی ناوەرۆک • هێمن حەساری

• بڵاوکراوەی • زانکۆی جیهان | خانەی بەڵگەکان

• تیراژ • ١٠٠٠ دانە

• چاپ • یەکەم ٢٠١٨ هەولێر





لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی (      )ی ساڵی ٢٠١٨ی وەزارەتی ڕۆشنبیری

ئەو وشەو بیروبۆچوونانەی کە لەم پەرتوکەدا نووسراوەتەوە سەرچاوەکەی بەڵگەکانەو ئێمە لێی بەرپرس نین، لەبەر ئەمانەتی زانستیش لەکاتی وەرگێڕانی دەستکاری نەکراوە.

# پێشەکی



لە ژێر هەر تاشەبەردێکی ئەم کوردستانە مێژوویەکی تێروتەسەل و پوخت خۆی شاردۆتەوە؛ بەڵام بە داخەوە بەهۆی نەبوونی پشکنین و بەدواداچوون مێژوویەکی دەوڵەمەند نادیار و وونە، لەبەر ئەوەی خەڵکی کوردستانیش بە گشتی و مێژوونووسان بە تایبەتی پێویستیان بەم مێژووە دەوڵەمەندەیە، لێرەدا دەبێ دەست و بازووی لێ هەڵکرێت و ئەو تاشەبەردانە هەڵدرێتەوە، بۆ ئەوەی لاپەرەکانی مێژوو بە رووداوە راست و دروستەکان پڕ بکرێتەوە، هەم بە رێگای ئەم بەدواداچوون و گەرانەدا بتوانرێت ئەو مێژووەی کە دوورە لە راستی، راست بکرێتەوە و لە شوێن ئەو زانیارییە راستەقینەکان شوێنی خۆیان بدۆزنەوە.

لێرەدا ئەو زانیارییانەی لە بەڵگەکاندا باسکراوان، بە دڵنیاییەوە بۆ مێژووی کورد زانیاری بە پیت و بەرەکەتە، بە شێوەیەك بەروبوومی مێژووی کورد زیاد دەکات و لە رووی داهاتەوە مێژوو دەوڵەمەند دەکات، چونکە ئەو ماوەیەی کە کورد لە ژێر دەسەڵاتی میللەتانی تر بووە، مێژووەکەی لەلایەن ئەو میللەتانەوە نووسراوەتەوە و کورد خاوەن مێژووی خۆی نەبووە،بۆیە ناچارین و پێویست دەکات لە ناو مێژوو و نووسراوەکانی میللەتانی تردا بە دوای مێژووی خۆماندا بگەرێین.

پێش چەمچەماڵ و بازیان، مێژووی هەولێر و دواتر بارزان و زێبار هەر یەکە لە دوو بەرگ زانیارییەکان کۆکرانەوە، ئەمەشیان پێنجەمین بەرگ کە مێژووی چەمچەماڵ و بازیان لە خۆ دەگرێت، دڵنیایین چۆن بەرگەکانی تر سوودیان بۆ مێژوونووسان هەبووە، ئەم بەرگەش بە هەمان شێوە سوودێکی لەرادەبەدەری دەبێت.

هەروەك چۆن بۆ هەموو لایەك روون بۆتەوە بەها و نرخی ئەو بەڵگانە چەند بۆ مێژوو گرنگە، هەر بۆیە بەکارهێنانی ئەو بەڵگانە لە توێژینەوەی دەرچوون و بەرزکردنەوەی پلەی زانستی لە هەر قۆناغێکدا بێت بایەخی تایبەتی خۆی هەیە. ئەم هۆکارە گرنگەش وای کرد یەکەی ئەرشیف و بەڵگەکانی زانکۆی جیهان بەردەوام بێت لە وەرگێرانی ئەم بەڵگانە و دواتر بیخاتە بەر دەست تا سوودی لێ وەربگرن.

**د. نەوزاد یەحیا باجگر**
**سەرۆکی دەستەی ئەمینداریەتی کەمپەکانی زانکۆی جیهان**

# چەند ڕوونکردنەوەیەك لە بارەی بەڵگەکان



1 • لە ناو بەڵگەکاندا هەڵەی ساڵ و مانگ و ڕۆژ کراوە؛ ئەوەی لە بارەی مێژووی ناو بەڵگەکانە ئەوا مێژووی کۆچی و ڕومی بەکارهاتووە، لە هەندێک بەڵگەشدا مێژووی ڕومي یا ئەوەتا کۆچیەکەی نووسراوەتەوە، بە تایبەتی لە ساڵە ڕومیەکە هەڵەی تێدا کراوە.



2 • جگە لەمەش هەڵەی ناوەکان هەیە، بۆ نموونە هۆز و ناوی کەسێتی، شوێن، لەبەر ئەوەی ئەو نووسەرەی نووسراوەکەی نووسیوەتەوە کوردییەکەی باش نەبووە، بە شێوازی سەر زاری خۆی ووشەکەی نووسیوەتەوە، یاخود لە بارەی ناوچە و شوێنەکانەوە شارەزاییەکی ئەوە تۆی نەبووە، زانیاری لە شێوەزاری ناوچەکەش نەبووە، ئەمەش وایکردووە بە هەڵە بینووسێتەوە، هەر بۆیە لە بارەی ناوەکانەوە هەروەکو خۆی نووسراوەتەوە، دەستکاری نەکراوە.



3 • لە بارەی وەرگێرانی بەڵگەکان ئەوا هەروەکو خۆی وەرگێردراوە؛ یەک ووشە زیاد یاخود یەک ووشە کەمی نەکردووە، تەنانەت هەوڵ دراوە لە کاتی وەرگێرانەکە دەستکاری دەستەواژە و ووشەکان نەکرێت، چونکە ئەگەر بە گوێرەی زمانەوانی کوردی دەستکاری دەستەواژە و ووشەکان بکرابووایە، ئەوا دەبووایە دەستکارییەکی زۆری دەستەواژەکان بکرێت، هۆکاری دەستکاری نەکردنەکەش دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە بەڵگەکان ڕەسەنایەتی خۆیان لە دەست نەدەن، لە هەمان کاتدا خوێنەر و مێژوونووسان لە شێوازی نووسینی بەڵگە و شێوەزاری ئەو سەردەمەی نووسەران ئاشنا بن، کە ئەو بەڵگانە بە چ شێوازێک نووسراونەتەوە، جگە لەوەش کاری نووسەر و مێژوونووسانە لە کاتی لێکۆڵینەوە لە زانیاری ناو بەڵگەکان ڕوون کردنەوە و شی کردنەوە بۆ بابەتی ناو بەڵگەکەکان بکەن.



4 • لە هەندێک شوێن لە ناو بەڵگەکاندا بۆشایی هەیە، ئەوانیش بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن؛ هۆکاری ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی لە کاتی نووسینەوەی نووسراوەکە هەندێک ووشەی نهێنی هەبووە، نەویستراوە ئاشکرا بێت، بۆیە نووسەرەکە بۆشایی بەجێ هێشتووە، تەنیا ئەوەی نووسراوەکەی گەیشتۆتە دەستی لەم بۆشاییە تێگەیشتووە و زانیویەتی نووسەر یاخود لایەنی پەیوەندیدار مەبەستی چییە.



5 • لە چەند شوێنێکی کەمیش بۆشایی بە خاڵ خاڵ هەیە (...) مەبەستیش لەم بۆشاییە بە خاڵانە ئەوەیە کە ئەو ووشەیە نەتوانراوە بخوێندرێتەوە، زۆر جار ووشە هەیە خوێندنەوەی زۆر ئەستەمە کە نووسەرەکە بە شێوەیەک یاخود بە خەتێک نووسیویەتی ناتوانرێ بخوێندرێتەوە، بۆ ئەوەی لە خوێندنەوەی هەڵە و لە ووشەی هەڵە دوورەپەرێز بین، بۆ ووشەکە بۆشایی بە خاڵ دانراوە.



6 • هەندێک ووشە یاخود ڕاستترە بڵێین زاراوە هەیە لەو سەردەمە بەکار هاتووە و مانای تایبەتی خۆی هەیە؛ ئەو مانایە نادەن کە ئێمە ڕۆژانە بەکاری دەهێنین و لێی تێدەگەین، جگە لەوەش وەرگێرانی ئەو ووشانە

بۆ کوردییەکەی لە نرخ و ماناکەی تێک دەدات و لە هەمان ئەو ئاستە نابێت، واتە مانای پڕ بە پێستی خۆی لە دەست دەدات، بۆیە نەکراوەتە کوردی و هەروەکو خۆی دانراوە، بەڵام بۆ ئەوەی خوێنەر و مێژوونووسان لە پێناسەی زاراوەکان ئاشنا بن، ئەوا لە (شیکردنەوەی زاراوەکانی عوسمانی) پێناسە کراوە و روون کراوەتەوە، لە هەمان کاتیشدا زاراوە هەیە، کە زانراوە لە ماناکەی ناگۆردێت، وەرگێردراوەتە سەر زمانی کوردی.



• جگە لەوانەی کە باسمان کرد بەڵگە هەیە، لە چەندین لاپەڕە پێک هاتوون، ئەو چەند لاپەڕەیەش باسی
یەک بابەتی دیاری کراو دەکات، بۆیە لەناویان تەنیا یەک لاپەڕە وەرگێردراوە، چونکە هەموو لاپەڕەکان
7 هەمان بابەت باس دەکەن، جیاوازیەکی ئەوەتۆیان تێدا نییە، بەڵام ئەگەر ئەو چەند لاپەڕەیە باسی چەند
بابەتێکیان کردبێت، یاخود هەر هەمان بابەت بەڵام بە شێوازی جیاواز باس کرابێت ، واتە هەر لاپەرەیەک
بە شێوازێکی جیاواز باسی بابەتەکەی کردبێت، لێرەدا ئەگەر لە بابەتەکە جیاوازی بەدی کرابێت، هەمووی
وەرگێردراوە.



• دووبارە بوونەوەی بەڵگە، کەمێک لە بەڵگەکان هەندێک بابەتی دیاریکراو دووبارە بوونەوەی بەڵگەی
تێدایە؛ واتە هەمان بابەت لە جیاتی ئەوەی هەمان ژمارەی بدرێتی، وەکو ئەوەی لە سەرەوە باسمان کرد،
8 بابەتەکە لە چەند لاپەڕەیەک پێک هاتووە، ئینجا لە جیاتی ئەوەی هەمووی کۆ بکرێتەوە و هەمان ژمارەی
بدرێتی، کەچی بە پێچەوانەوە هەمان بابەت ژمارەی جیاجیایان دراوەتێ، لێرەدا بە ناچاری هەمان بابەت
کە لە ژمارەی جیاجیا پێک هاتووە، وەرگێردراوە، چونکە ژمارەیان جیایە و هەمان ژمارەی نەدراوەتێ.



• لە هەندێک بەڵگەدا لە کاتی نووسینەوەی رووداوەکان و زانیاری لە بارەی ناوچەکانەوە بە گشتی باسی
9 بابەتەکان کراوە، بۆ نموونە شوێنی عەرەب نشینیش باس کراوە؛ لێرەدا تەنیا ئەوەی پەیوەندی بە کورد و
ناوچەکانی کوردییەوە هەیە وەرگێردراوە.



• لە نێو بەڵگەکاندا دەستەواژەی دووبارە و رستەی دووبارەی تێدا بەرچاو دەکەوێت، لێرە دا نووسەر لە
10 کاتی نووسینەوەی نووسراوەکەدا هەمان زانیاری یاخود دەستەواژەی دووبارە کردۆتەوە و هەمان زانیاری
نووسیوەتەوە.



• لە بارەی ساڵی بەڵگەکان ئەوا بۆ ریزبەندی بەڵگەکان تەنیا ساڵی کۆچی بەکار هاتووە، پشت بە مانگ
و رۆژەکەی نەبەستراوە؛ جگە لەمانەش ساڵی ناو بەڵگەکان بە گوێرەی زانیاری ناو بەڵگەکە و ئەوەی
11 سەر بەرگەکەی گۆرانکاری بەسەر دادێت، واتە نووسەر لە کاتی نووسینەوەی بەڵگەکەی ئەم ساڵەی
نووسیوەتەوە کە بەڵگەکەی تێدا نووسیوەتەوە، کەچی کە گەیشتۆتە لای پاشا ئەو ساڵەی نووسیوەتەوە
کە نووسراوەکەی تێدا بینیوە، هەندێک جاریش ساڵی جێبەجێ کردنەکەی لەسەر نووسراوە، واتە لە یەک
نووسراودا مەبەست بەڵگەکەیە چەند ساڵێکی جیاواز بەرچاو دەکەوێت.

**وەرگێر**

# وشەکان



| | |
|---|---|
| ئاڵای (الای) | ئاڵای بە مانای کۆمەڵ، قەڵەباڵغ دێت، لە زاراوەی سەربازیش ووشەیەکە لە سێ چوار تابور پێک دێت، هەروەها هەر ئاڵایەک سەنجەقێکی لە ژێر دەستدا بوو. |
| ئەعیان (اعيان) | لە سەرەتا بۆ بەدواداچوونی بریارەکانی ئەنجوومەنی میللەت ئەنجوومەنێکی تر هەبووە و ئەم ئەرکەیان پێ سپێردراوە، ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ساڵانی ١٨٧٧ و ١٩٠٨ ئەندامەکانی لەلایەن حکوومەتەوە هەڵبژێردراوە. |
| ئەنبار | شوێنێکە بۆ هەڵگرتنی زەخیرە و هەموو کەلوپەلێک بەکارهاتووە. |
| ئەنجوومەنی واڵا (مجلسی والا) | ئەنجوومەنی واڵا لە ساڵی ١٨٣٧ دامەزرا، ئەم ئەنجوومەنە کاری ئەوە بوو، داواکاری نێوان دەوڵەت و خەڵک جێبەجێ بکات، لە ساڵی ١٨٦٧ هەڵوەشایەوە و لە شوێن ئەو شورای دەوڵەت دامەزرا. |
| ئستەبڵی عامیرە (اصطبل عامره) | تەوێڵەی کۆشکی پاشا. |
| ئۆچاقلق (اوجاقلق) | ئەو زەوییانەن کە جیاکرابوونەوە و داهاتەکانیان بۆ پارێزگارانی قەڵا و کۆگای چەک دەڕۆیشت. |
| ئۆن باشی (اونباشی) | ئەو سەربازەیە کە قوماندانیەتی ١٠ نەفەری کردووە، ئەمەش لە نێوان نەفەر و چاوشەکە دەبێت. |
| ئیستیناف (استيناف) | دووبارە دەست پێکردنەوە، ئەو بریارەی لە دادگای سەرەتایی دەدرا، بۆ ئەوەی بریارەکە هەڵبوەشێنرێتەوە سەردانی دادگایەکی سەرووتر واتە لە ئەو بەرزتر دەکرا تا بریارەکە هەڵبوەشێننەوە. |
| بابی عالی | بنکەی سەدری ئەعزەم، دیوانی هومایۆن لەگەڵ نەزارەتی ناوەخۆ و دەرەوە و فەرمانگەی شورای دەوڵەت دەگرێتەوە. |
| باش کاتیب (باش كاتب) | نووسەری یەکەم یاخود سەرۆکی نووسەران، ئەرکەکەشی لە فەرمانگە فەرمییەکاندا سپێردراوە بە نووسینی نووسراو. |
| باش کیتابەت (باش كتابت) | کیتابەت واتە پیشەی نووسین، باش کیتابەت یەکسانە بە باش کاتیبی، واتە سەرۆکی نووسین. |
| باشبوغ | قوماندانی سەربازی رێک نەخراو یاخود نارێک |
| بەرائەتی شەریفە | واتە پاکانەی ئەستۆ و خۆبەرێکردن، لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆ وەرگرتنی زەوی کشتوکاڵی یاخود دامەزراندن دەبووایە لەلایەن پاشاوە یاخود دەوڵەت بەرائەتی شەریفە واتە پاکانەی ئەستۆی وەرگرتبووایە. |
| برادەر زادە | برادەر زادە منداڵی خوشک و برا، هەروەها برازا، پورزا، خاڵۆزا دەکات. |
| برادەری | واتە برا. |
| بلۆک (بلوک) | دەستەی سەربازی. |
| بلۆک باشی (بلوک باش) | سەرۆک یاخود بەرپرسی بلۆک. |
| بینباشی (بيكباشى) | بین بە مانای هەزار کەس دێت، بینباشی، ئەو ئەفسەرەیە یاخود قۆماندانەیە کە تابورێک بەڕێوە دەبات لە هەزار سەرباز پێک هاتووە. |
| تابور | لەشکری سەربازی، کەرتی سوپا. |
| تاتار | نامەی گواستۆتەوە بۆ ناوچەکانی تری دەوڵەت، جولەی زۆر خێرابووە، جگە لە ناوی تاتار ئەوەی ئەو کارەی کردووە ناوی (ساعی، پۆستە، قاسد، برید)یشی پێ ووتراوە، لە کاتی خۆیدا تاکی تاتار بە خزمەتی خێرا رۆیشتن بەناوبانگ بووە، بۆیە بەم مانایەی پێیان ووتراوە تاتار. |
| تەحسیلدار (تحصيلدار) | ئەو فەرمانبەرەیە کە باج و باجی داهاتو و بەروبوومی داهات کۆدەکاتەوە. |
| تەرسانە (ترسانە) | یاخود تەرسخانە ئەمەش ئەو شوێنە بوو کاروباری کەشتییە جەنگیەکانی تێدا دەکرا، واتە کارگەی دەریایی و کاروباری دەریایی کە تێدا کارەکانی تێدا جێبەجێ دەکرا، یەکسانە بە تەرسانەی عامیرە (ترسانە عامرە). |

| | |
|---|---|
| تەغار (تغار) | چوار ربە یەك تەغارە. |
| تیمار | ئەو زەوییە کشتوکاڵیانەن کە ساڵانە داهاتیان لە نێوان ٣٠٠٠ ئاقچە لەگەڵ ٢٠٠٠٠ ئاقچە دایە، ئەم جۆرە زەوییەش بەو سەربازانە دەدرا کە لە شەڕ سوودیان لێ وەردەگیرا یاخود بەو کەسانە دەدرا کە لە بواری ئایینەوە ئەرکیان پێ سپێردرابوو، ئەمەشیان بۆ ئەوە بوو تا بژێوی ژیانی خۆیان پێ دابین بکەن، لە جیاتی مووچە پێیان دەدرا. |
| پارە | وشەیەکی فارسیە، یەک قوروش چل پارەیە، یەک پارەش دەکاتە سێ ئاقچە. |
| پۆست نشین | بە شێخی تەکیە وتراوە پۆست نشین، لە هەمان کاتدا بە کەسێك ووتراوە کە لە پلەیەك دانیشتووە واتە پلەیەکی هەبووە و کارەکەی بەڕێوە بردووە. |
| حەرەم (حرم) | ئەو شوێنەیە کە هەموو کەسێك ناتوانێ بە بێ مۆڵەت بچێتە ژوورەوە، بە تایبەتی ئەو شوێنانەی کە تایبەتن بە ئافرەت و ژووری ئافرەت. |
| جەبەخانە (جبەخانە) | ئەو شوێنە بووە یاخود ئەو کۆگایە بووە هەموو جۆرە چەک و باروت و کەلوپەلی چەکی ئاگری تێدا پارێزراوە. |
| جەلیلە (جلیلە) | جەلیلە ناوداری گەورە، وەزیر یاخود موشیرەکان هەروەها کە نووسراو بۆ فەرمانگەی ئەوان دەکرا، بەم شێوەیە ڕێزیان لێ دەگیرا، هەروەها لە پلەی ئەوان نزمتر پێیان دەوترا بەهییە یا عالییە. |
| خاخام | زانا و بەرپرسی یەهودیەکان، واتە کاهین. |
| خەلافەتپەناهی (خلافتپناهی) | خەلیفە شوێن گرەوەی کەسێک، کە لە دوای پێغەمبەر وەکو وەکیلی پێغەمبەر، ئەرکێک بوو لە ئیسلام داهێنرا، پەناهی واتە پەیوەندی، خەلافەت پەناهی واتە شتێک کە پەیوەندی بە خەلیفەوە هەیە و لەلای ئەوەوە دەردەچێت. |
| خەیل (خیل) | تاقم، خەڵکێکی زۆر، بە تاقمی سوارەش دێت. |
| خولعە (خلعە) | ئەو جلە بوو چەند جۆرێکی هەبوو، جۆرەکانیشی جلی ڕێز لێنان، جلی پەشیمانی یاخود جلی مردن بوو، ئەم جلەش لەلایەن پاشاوە بە کەسێک دەدرا. |
| دەرسەعادەت | ئیستەنبوڵ پایتەختی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. |
| دەفتەردار (دفتردار) | سەرۆکی ژمێریاری، بەرپرس لە کاروباری دارایی. |
| دەفتەر خاقانی (دفتر خاقانی) | دەفتەر خانەشی پێ ووتراوە فەرمانگەیەك بووە کاروباری پارەی دەوڵەت، موڵك و زەوی و زاری بەڕێوە دەبرد، بۆ نموونە تاپۆ. |
| دزدار | پارێزگاری قەڵا. |
| ژورنال | ژورنال دەفتەری ڕووداوەکان، یاخود دەفتەری رۆژانە. |
| رایج | رایج بەهاکەی تری، واتە نرخەکەی تری یاخود بەهای رابردووی. |
| رەدیف (ردیف) | بەو سەربازانە وتراوە رەدیف کە لە دواوەی سەربازی ڕێکخراو دەوەستان و ئەوانەش لە کاتی پێویست چەکیان پێ دەدرا. |
| رەژی (رژی) | فەرمانبەرانی فەرمانگەی تووتن. |
| روزهزر و روزقاسم | (Hıdırellez) لە دونیای تورک وەرزێکە جەژنی بۆ ساز دەکرێت، روزی هزر (Ruz-ı Hızır) واتە (رۆژی هزر) کە بە ناوی رۆژی خدری لەز (Hıdırellez) ناو نراوە، بە پێی داستانی ئەو سەردەمە ئەو رۆژەیە لە سەر ڕووی زەوی پێغەمبەر خدر و ئیلیاس بەیەک گەیشتوون، تاوەکو یارمەتی هەژار و لێقەوماوان بدەن. لە تورکیاش جەژن بۆ ئەم بۆنەیە دەگێردرێت. بە پێی رۆژژمێری زایینی رۆژی خدری لەز لە ٦ مایس، لە کۆنیش بە پێی رۆژژمێری رومی رۆژی ٢٣ نیسان هەژمار دەکرێت. ماوەی نێوان ٦ مایس تا ٨ تشرینی دووەم بە ناوی رۆژەکانی هزر وەرزی هاوین، هەرچی ماوەی نێوان ٨ تشرینی دووەم تا ٦ مایس بە ناوی رۆژەکانی قاسم وەرزی زستان پێک دەهێنن. بەم شێوەیە رۆژی ٦ مایس تەواو بوونی وەرزی زستان و دەست پێکردنی وەرزی هاوین و رۆژە گەرمەکان نیشان دەدات. |
| روسوم (رسوم) | باج و باجی گومرگ. |
| روسومات (رسومات) | فەرمانگەی گومرگ. |

| | |
|---|---|
| ریاسەتپەناهی (ریاستپناهی) | پەیوەستە بە سەرۆکایەتیەوە، کە پابەندە بە کارەکانی پاشا، بۆ نموونە بۆ لایەنی پاشای ریاسەتپەناهی. |
| ریال | ریال پارەی زیوی ئاسیاوییە، دەکاتە ٢٥ قوروش. |
| ریکابی هومایۆنی شاهانە (رکاب همایونی شاهانە) | سەربازە سوارەکانی پاشا. |
| ریکابی هومایۆنی قەپوچی باشی | بەرپرسی یاخود سەرۆکی دەرگای سەربازە سوارەکانی پاشا. |
| سالیانە | ئەو باجەیە ساڵی جارێك وەردەگیرێت، لە پێش تەنزیمات بەشێك لە فەرمانبەران و بەکارهێنراوان بە ئەرك ساڵی جارێك کرێیان پێ دراوە. |
| سەدارەت (صدارت) | شوێنی کاری سەدری ئەعزەم و پلەکەیەتی. |
| سەدارەتپەناهی | پەیوەندی بە سەدری ئەعزەمەوە هەیە، وایە ئاماژەیە بۆ سەدری ئەعزەم. |
| سەدری ئەعزەم (صدر اعظم) | لە دەوڵەتی عوسمانی پلەی لە سەرۆک وەزیرانی ئێستا بووە، یاخود وەکیلی پاشا بووە. |
| سەر عەسکەر (سر عسکر) | سەر وشەیەکی فارسیە بە واتای سەر دێت، سەر عەسکەر بە واتاکانی ئێستا بە مانای سوپا سالار، سەر لەشکر، سەرکردەی سوپا، قوماندان دێت. |
| سەر کاتیب (سر کاتب) | سەرۆک یاخود یەکەم نووسەر. |
| سەعادەت (سعادت) | واتە خۆشی. |
| سەفەربەرلیك(سفربرلك) | چوونە شەر، واتە بەو کەسانە ووتراوە کە خۆیان ئامادە کردووە تا بچنە شەر یاخود بۆ چوونە شەر لە ئامادەباشی دابوونە. |
| سەلاملك (سلاملك) | لە کۆشکە گەورەکاندا بەو ژوورە دەوترا کە بۆ پێشوازی کردن لە میوانان تەرخان کرابوو. |
| سیپاهی (سپاهی) | ئەو سەربازە سوارەیە خاوەنی تیمارە واتە زەوی کشتوکاڵییە، لە لەشکری عوسمانی کۆندا چینێک سەربازی سوارە هەبوو، لە بەرامبەر ئەو دە یەکە (عشر) لە زەوی کشتوکاڵی وەریاندەگرت لەگەڵ ئەو ئاژەڵانەی کە خۆیان بەخێویان دەکرد بەشداری جەنگیان دەکرد، بەڵام کەلوپەلی جەنگی لەلایەن دەوڵەتەوە پێی دەدرا. |
| سیپاهیدار (سپاهدار) | گەورەترین سەرباز، سەر عەسکەر. |
| سیلاحشۆر (سلاحشور) | واتە پیاوی چەکدار، ئەو پیاوانە بوونە لە چەك هەڵگرتن و بەکارهێنانی شارەزاییەکی تەواویان هەبووە، لە شەرەکان بە چەك شەریان کردووە. |
| شاهنشاه | گەورەترین پاشا یا شا، واتە پاشای پاشایان یاخود شای شایان. |
| شەهبەندەر (شهبندر) | بە واتای باڵیۆز دێت، لە سەردەمی مەحمودی دووەم لە ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆ پاراستنی بازرگانە موسڵمانەکانی ناوەخۆ، لە نێوان خۆیان کەسێکیان هەڵدەبژارد تا هەر ناکۆکی و لێك تێنەگەیشتنێك هەبێت چارەسەری بکات. |
| شورای دەوڵەت بە زمانی عوسمانی (شورای دولت) | لە دەوڵەتی عوسمانیدا پێش ئەو دامەزراوەیە، ئەنجوومەنی والا کارەکانی دەکرد دوای هەڵوەشاندنەوەی ئەنجوومەنی والا شورای دەوڵەت لە ساڵی ١٨٦٨ دامەزرا، جۆری کارەکەی لە کاری کارگێڕی پێک دەهات، ئەرکەکەشی دۆزینەوەی چارەسەر بۆ کێشە کارگێڕییەکان و دەرکردنی یاسای گونجاو بوو، ئەم دامەزراوەیە تا ساڵی ١٩٢٢ بەردەوام بوو. |
| چاوش | وشەیەکی تورکیە ماناکەی سەربازی پلە بچووکە، لە ئەمڕۆشمان لە رووی سەربازییەوە بە پلەی پاسەوان دێت. |
| چەڵتوك (چلتوك) | برنج. |

| | |
|---|---|
| ڤۆیڤۆدە | لە سەردەمی عوسمانیەکان ئەو پاشایە بوو، کە سەر بە خەزینە بوو، فەرمانبەرێک بوو ئەو داهاتانەی ڕێک دەخست کە لەلایەن ئافرەت، ئەفەندی، سەدری ئەعزەم، وەزیر، بەگی بەگان و بەگی سەنجاقەکانەوە دەهات، هەروەها ئەوانە ئەرکێکی تریان هەبوو، ئەویش پاراستنی ئاسایش و ڕێکخستنی شوێنە تایبەتیەکانیان پێ درا بوو، ئەو شوێنەی ڤۆیڤۆدەکانی تێدا بوون، بەهۆی ئەوەی لە بەڕێوەبردنەوە پیاوی هێز بوون، ئەمەش وای کرد بوو ناوە ناوە کێشە بۆ دەوڵەتی عوسمانی دروست بکەن. |
| عولوفە (علوفە) | ئەو زاراوەیە بوو کە لە سەردەمی عوسمانیەکاندا بەو سەربازانە دەوترا کە سێ مانگ جارێک مووچەیان وەردەگرت. |
| فەریق (فریق) | تاقم، تیپ، دوو لایەن، کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر، بە پلەی سەربازیش دێت، لە کۆن لە چینی سەربازی لە دوای موشیر دەهات، ئەویش گەورەترین پلەی سەربازی بوو. |
| فرقە | دەستە، کۆمەڵ. |
| قەپوچوقدار (قپوچوقدار) | ئەرک و خزمەت بوو، ئەو فەرمانبەرانە بوون لە بابی عالی لە ویلایەت لە خزمەتی قەپوکەتهودا دابوون و هەندێک داواکاری والییان جێبەجێ دەکرد. |
| قەپوچی باشی | بەڕێوەبەری ئەو چینەیە کە لە بەردەم دەرگای کۆشک وەستاون. |
| قەپوکەتهودا (قپوکتهودا) | قەپوکەتهودا خزمەتکاری دەرگا بوون. |
| قەساس (قصاص) | سزای شەرعی بکوژی کوژراو و برینداركاری بریندارکراوەکەیە، بۆ میراتی کوژراو داوای قەساس دەکەن، وەک بکوژیان قەساس کرد. |
| قپوچی باشی (قپوچی باشی) | قەپوچی بە دەرگای فەرمانگە و شوێنە فەرمییەکانی دەوڵەت دەوترا کە خەڵک بۆ ئیشوکارەکانیان لەم دەرگایە دەچوونە ژوورەوە و دەهاتنە دەرەوە، بێگومان ئەو دەرگایانەش بەرپرس و سەرۆکیان هەبووە، جگە لەوە قەپوچی باشیش پلەیەک بووە دراوەتە فەرمانبەرانی دەوڵەت، بۆ نموونە ریکابی هومایۆنی قەپوچی باشی (رکاب همایونی قپوچی باش). |
| قۆل ئاغا (قول اغا) | بە واتای قۆڵ، لێرەش قۆڵی ئاغا یەکسانە بە ئەفسەری یەک قۆڵی تابور، یا خود یاریدەدەری بینباشی، قۆڵی ڕاست و چەپی ئاغا. |
| قولی | قول؛ ئەو پیاوەیە بۆ ئەرك جێبەجێ کردن دەکرێت، هەرچی قولی؛ ئەو فەرمانبەرەیە بۆ چاودێری کردنی سەربازانی دوژمن و سەرپەرشتی کردنی زەوی و زار ئەرکی پێدەدرێت. |
| قوماندان | قوماندان سەرۆک یاخود بەرپرسی ئەفسەر دەکات، وەکو قوماندانی تابور، قوماندانی لەشکر، قوماندانی ئاڵای، قوماندانی ژاندارمە. |
| قۆناغ (قوناغ) | قۆناغ واتە مەنزل، لە ڕێگا بۆ گەشتیاران و کاروانچیان دروست دەکرا، تا تێدا بحەسێنەوە و بخەون، هەروەها بۆ دەستنیشانکردنی دووری شوێنێک دەیانووت سێ قۆناغ یاخود چوار قۆناغ دوورە، واتە چەند قۆناغ لە نێوان ئەو دوو ناوچەیە هەبوایە هەژمار دەکرا، جگە لەوە بە کۆشکی پاشا و گەورەکان دەوترا قۆناغ یا قۆناق. فەرمانگەی حکوومەتیش پێی وتراوە قۆناغ وەکو قۆناغی حکومەت، کە هۆبەیەک لە هۆبەکانی فەرمانگەی فەرمی حکومەت پێی دەوترا قۆناغی حکومەت. |
| قیە | دەکاتە گرانی ٤٠٠ درهەم، بۆ دە یەکیش بە واتای کیلۆ دێت، کە بە قورسایی ١٠٠٠ گرام دەکات. |
| کەتهودا (کتهودا) | واتە خزمەتکار ئەوانەی بە پلە لە فەرمانبەر پلەکەیان نزمتر بوو، پێیان دەوترا خزمەتکار. |
| کەلەك (کلك) | ئەو پارچە دارانەن کە بە ئاو ئەستوور کراون و یەك لە دوای یەك لە پاڵ یەکتر بە داو بەیەکتریەوە بەستراونەتەوە و تەختەیەکیان لێ پێکهێنراوە، ئەمەش بۆ گواستنەوەی مرۆڤ و کەلوپەل لە ڕووبارەکانی جەزیرە بە تایبەتی لە دیجلە بەکار هاتووە، ئەم کەلەکە بە گوێرەی گەورەییەکەی بۆ بەڕێوەبردنی ٢ تا ٦ پیاوی پێویستە. دوای تەواو بوونی گەشتەکە بە تایبەتی لە سەر ڕووباری دیجلە تا دەگاتە بەغداد بەشی دارەکانی کەلەکەکە زۆر جار بە نرخێکی هەرزان دەفرۆشرا، هەروەها قازانجی ڕاستەقینەی کەلەکچیەکان لەو کرێیە پێك هاتبوو کە لە کاروانچیەکان وەریاندەگرت. ئەو کەلەکچیانە لەسەر ڕووباری دیجلە تا خوارەوە کەرستەی بیناکاری و دانەوێلە و باری گرانیشیان بار دەکرد. لە جەنگی جیهانی یەکەم سەربازیشیان پێ گوازراوەتەوە. |
| کیل | کیلە، بۆ پێوانی دانەوێلە بەکارهاتووە. |
| مەشروتیەت (مشروطیت) | مەشروت واتە مەرجدار کە پەیوەستە بە مەرجەکانەوە، مەشروتە واتە لەلایەن یەکەم خاوەنیەوە بە مەرجی نەفرۆشتن بۆ میراتگرەکانی بەجێی هێشتووە، ئەویش وەکو خانوو، زەوی کشتوکاڵی، نەخۆشخانە، مزگەوت، هەرچی مەشروتیەتە ئەوا ئەو حوکمدارە دەگرێتەوە کە لە ژێر دەسەڵاتی سەرۆکایەتیە. |

| | |
|---|---|
| مەمالیکی مەحروسەی شاهانە (ممالیکی محروسە شاهانە) | وولاتی عوسمانی. |
| مەمالیك (ممالك) | وولاتەکان، مەملەکەتەکان، خاکی وولاتێك. |
| مەملوک (مملوک) | کەسێک پارەی هەبێت، یاخود بەندە، کۆیلە. |
| مەنزل | لە بنەڕەتدا وشەیەکی عەرەبیە، بە زۆر مانا دێت، ئەوەی لە زمانی عوسمانیدا پێویستە بە مانای کۆشک، شوێنی کوشک، سەرە ڕێگای یەک ڕۆژ دێت، یاخود بە مانای دووری نێوان دوو کۆشک دەکات، تاتارەکان لە کاتی بردنی پۆستە بۆ ناوچەکانی تر، لەم مەنزیلانە هاتوونەتە خوارەوە و حەساونەتەوە، هەروەها ئەسپیان گۆڕیوەتەوە، یاخود شەویان لەوێ بەسەر بردووە. |
| موشیر (مشیر) | بە مانای ئاماژە پێکردن دێت، لەلایەکی تر لە چینی سەربازی لەگەڵ وەزارەت یەکسانە، کە گەورەترین پلەی سەربازیە، بۆ نموونە موشیری لەشکر، موشیری تۆپخانە. |
| موعەجەلە (معجلە) | موڵکی میریە و لە وەقف دیارە، هەر لە وەقف مامەڵەی بۆ دەکرێت، کە پارەکەی پێش وەختە دەدرێت. واتە بە شێوەی بەگایەتی و وەرگرتنی پارەی پێشەکی لەلایەن ئاوقافەوە دەبێت. |
| موقاتەعە (مقاطعە) | ووشەی موقاتەعە هەر لە سەرەتاوە، ئەو زەویيانە بوونە کە خاوەنداریەتی بۆ دەوڵەت یاخود وەقفەکان بووە، بە کرێ دراوەتە کەسی تایبەت و دامەزراوەکان بە شێوەی ڕێککەوتن بووە، جگە لەوەش بڕی پارەکە دیاری دەکرا و ئەو پارەیەش ڕاستەوخۆ دەچووە خەزینەی دەوڵەت. |
| میعمارباشی (معمارباشی) (سەرۆکی بیناسازی) | سەرۆکی بیناسازی، کاری سەرپەرشتکردنی بیناسازی، هەروەها لە پیشەکەی خەریکی دابەشکردن و ڕێکخستنی کارەکەی بووە. |
| نازر (ناظر) | لە بینین هاتووە، واتە سەیرکردن، کە لە هەموو شوێنێک ئامادە و سەیرکەرە، ئەرکەکەشی بەڕێوەبردن و بەڕێکردنی کاروبارەکانە، وەکو نازری دارایی. |
| هومایۆن (هومایون) | پاشا. |
| وەکالەتپەناهی (وکالتپناهی) | پیشەی سەدری ئەعزەم، ئەو کارەیە کە پەیوەندی بە سەدری ئەعزەمەوە هەیە، یەکسانە بە سەرۆکی بریکار. |
| یوزباشی | لە بنەڕەتدا بە مانای ١٠٠ کەس دێت، لە رووی سەربازییەوە ئەو ئەفسەرە دەگرێتەوە کە قۆماندانیەتی یەک بلۆک سەرباز دەکات لە ١٠٠ سەرباز پێکهاتوون، بۆ نموونە یوزباشی سوارە، یوزباشی پیادە، یوزباشی ژاندارمە، یوزباشی ڕەدیف. |
| یوک | یوک بە مانای بار دێت، هەڵگرتنی بار ئینجا چ لەلایەن مرۆڤەوە بێت یاخود ئاژەڵ وەکو بارگیر و ئەسپ و گوێدرێژ، لەلایەکی تر بە مانایەکی تریش دێت کە یەک یوک دەکاتە بڕی ٥٠٠ هەزار قورووش. |




<table>
<tr><td>I.DH.</td><td>00826.066514</td><td>23 ڕەبیعی کۆتایی 1298</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ جەنابی ئەفەندیم<br>لـە نـاو سـلێمانیە دایـە، دانیشـتووانەکەی پەرشـوبڵاوبوونەتەوە و لـە قائیمقامیەتـی بازیـان و مەعمـورە کشـتوکاڵی پێشـوو دووبـارە کراوەتـەوە، هەروەهـا بـۆ ئـەوەی لـە پەلامـاری چەتـەکان بیانپارێـزن، یـەك یوزباشـی بـە هـاوکاری یـەك مـولازم بـۆ مـاوەی یـەك سـاڵ ٥٠ بـۆ ٦٠ نەفـەر بەکارهێـنراون، لـە داواکاری ڕەزامەنـدی لەسـەر تەلەگرافنامـەی پایـەی ویلایەتـی موسـڵ لەگـەڵ نەزارەتەکانـی جەنگـی و دارایـی ڕاگەیاندنـی هەواڵـی گشـتی بـە نـووسراوی هاوپێـچ نـووسراوی نەزارەتـی ناوەخـۆی جەلیلـە ڕاگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـە وەڵامـی کۆتایـی نەزارەتـی جەلیلە نیشـان دراوە، ئەوانـە لـە سـەرەتای ٩٧ ی مـارت نـووسراو و بەکارهێنـان و خەرجیەکانیـان لـە دەفتـەری تایبەتـی بـە جیـا جیـا نیشـان داوە، لـە ویلایـەت ئـەم سـاڵە لـە بودجـەی ئـاڵای پۆلیـس نووسراوەتـەوە و ڕاگەیەنـدراوە، مۆڵەتیـش دراوە لەسـەر جێبەجـێ کردنـی، بەهـەر شـێوەیەك بێـت ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی پاشـایە، بفەرمووێت بەپەلـە جێبەجێ دەکرێـت و ڕادەگەیەندرێـت، لـە 23 ڕەبیعـی کۆتایـی 1298 و لـە 12 مـارت 1297.</td></tr>
</table>



Y.PRK.ASK.00041.00005.001

| **Y.PRK.ASK.** | **00041.00005** | 14 زیلقەعدە 1300 |
| --- | --- | --- |

لە پلەوپایەی سەر عەسکەر
قەڵەمی نووسین
تایبەتی

تابوری سێیەمی ئالآی ٤٥ی پیادە بۆ چەمچەماڵ و تابوری چوارەمی ئالآی ٤٦ی چەمچەماڵیش بۆ سەڵاحیە و تابوری دووەمی ئالآی ٤٥ی سەڵاحیە بۆ سلێمانیە و تابورەکانی دووەم و سێیەمی ئالآی ٤٦ لە سلێمانیە بۆ کەرکووك وەردەگیرێن، بۆ ئەم مەبەستەش فەرمان دراوەتە قوماندانیەتی لەشکری همایۆن لە ئەنجام کارەکە جێبەجێ کرا، لەسەر ئاماژەی قوماندانیەتی فرقەی ١٢ لە قوماندانیەتی لەشکری شەشەمی همایۆن لە مێژووی ٢٢ تەمموز ١٣٠٣ تەلەگرافنامە هاتووە و ئاماژەی پێکراوە، بۆ راگەیاندنیشی پەلەی لێکراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

لە ١٤ زیلقەعدە ١٣٠٠ و لە ٢٣ تەمموز ١٣٠٣
عەلی رزا سەر عەسکەر



| 1301 جەمادی یەکەم 10 | 00910.072271 | I.DH. |
| --- | --- | --- |

بۆ جەنابی ئەفەندیم
لە سانجەقی سلێمانیە قائیمقامی قەزاکانی بازیان و شەهربازار، عەبدولرەحمان بەگ لەگەڵ داود ئەفەندی پارەی میریان بە خراپی بەکار هێناوە، لەبەر ئەوەی جموجۆڵی دژی سەروویان ئەنجام داوە، بۆیە براونەتە ژێر دادگا، لە شوێن ئەوان کەسانی گونجاو دابمەزرێن، ئەمەش لە ویلایەتی موسڵ ئاماژەی پێکراوە، بۆ قائیمقامیەتی قەزای بازیان قائیمقامی پێشوو ئیبراهیم سدقی ئەفەندی هەڵبژێردراو لە چینی سێیەم لە بارەی دامەزراندنیەوە بریارنامەی قۆمیسیۆنی هەڵبژاردن لەگەڵ نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە پێشکەش کراوە، هەر چۆنێك بێت ئەمر و فەرمانی جەنابی پاشا هەر کاتێك بفەرموێت بەپەلە جێبەجێ دەکرێت، لە ١٠ جەمادی یەکەم ١٣٠١ و لە ٢٥ شوبات ١٢٩٩.




| ŞD. | 02155.00025 | 24 شه‌عبان 1301 |
|---|---|---|

بۆ جه‌نابی به‌ڕێزم
ویلایه‌تی موسڵ
ژماره‌ ٤٧
بۆ نه‌زاره‌تی ناوه‌خۆی جه‌لیله‌ی لایه‌نی سه‌روو
ڕاگه‌یه‌ندراوی به‌ندەیە
قه‌زای بازیان سه‌ر به‌ سانجه‌قی سلێمانیه‌ ده‌سته‌ی حكوومه‌ت هه‌ر له‌ مێژه‌ له‌ قه‌ڵای چه‌مچه‌ماڵ كه‌ قه‌زای ناوهاتوو مه‌ركه‌زه‌كه‌یه‌تی نیشته‌جێ بوونه‌، به‌م دواییه‌ سه‌ربازی شاهانه‌ی نیزامیه‌ نیشته‌جێ كراون، ئه‌و فه‌رمانبه‌رانه‌ هه‌ر له‌ مێژه‌ به‌ ناچاری به‌ په‌رشوبڵاوی ده‌ستیان به‌ ئه‌ركه‌كه‌یان كردووه‌، له‌م بارودۆخه‌ش ئه‌و ناوچه‌یه‌ بۆته‌ هاتووچۆی هۆزه‌كان، ئه‌مه‌ش كاریگه‌ری كردۆته‌ سه‌ر كاروباره‌كان، بۆ نیشته‌جێ كردنی فه‌رمانبه‌رانی جه‌نابی پاشا له‌ ساڵی ٩٩ سه‌ره‌تایی كانوونی یه‌كه‌م مانگانه‌ به‌ ١٠٠ قوروش خانه‌یه‌ك به‌ كرێ بگیرێت، ئه‌مه‌ش به‌ ئاماژه‌ی بڕیارنامه‌ی ئه‌نجوومه‌نی كارگێری لیوای ناوهاتوو هه‌روه‌ها كرێی ئه‌و خانانه‌ فه‌رمان و ڕه‌زامه‌ندی له‌ نه‌زاره‌تی جه‌لیله‌ی پێویسته‌، به‌ حه‌واڵه‌ش له‌ ژمێریاری ویلایه‌ت په‌راوێزی نووسراوه‌ته‌وه‌، ئه‌مر و فه‌رمان بۆ جه‌نابی ئه‌و كه‌سه‌یه‌ كه‌ فه‌رمان ده‌رده‌كات.
له‌ ١٦ ڕه‌بیعی كۆتایی ١٣٠١ و له‌ ٢ شوبات ١٢٩٩.
بریكاری والی

له‌ سانجه‌قی سلێمانیه‌ بۆ نیشته‌جێ كردنی ده‌سته‌ی حكوومه‌ت له‌ قه‌زای بازیان له‌ ساڵی ١٢٩٩ سه‌ره‌تای كانوونی یه‌كه‌م مانگانه‌ ١٠٠ قوروش به‌ كرێ خانه‌یه‌ك ده‌گیرێت، ئه‌م كاره‌ ڕه‌زامه‌ندی له‌سه‌ر دراوه‌ به‌ڵام له‌ ده‌ره‌وه‌ی بودجه‌ به‌بێ فه‌رمان، به‌ بێ به‌رامبه‌ر دابین كردنی ئاقچه‌ به‌ یاسا قه‌ده‌غه‌یه‌، بره‌ پاره‌ی دیاریكراو له‌ ساڵی ٩٩ ده‌درێت، بره‌كه‌شی له‌ ساڵی باسكراودا له‌ كاتی كردنه‌وه‌ی بودجه‌ و ڕێكخستنی زیاده‌كه‌ی هه‌ژمار ده‌كرێت، هه‌روه‌ها له‌ بوودجه‌ی ساڵی ١٣٠٠ به‌ زیادكردنه‌كه‌ی سه‌باره‌ت به‌ دابینكردنی نوسراو حه‌واڵه‌ی شورای ده‌وڵه‌ت كراوه‌، ئه‌مر و فه‌رمان بۆ جه‌نابی ئه‌و كه‌سه‌یه‌ كه‌ فه‌رمان ده‌رده‌كات.
له‌ ٢٤ شه‌عبان ١٣٠١ و ٦ حوزه‌یران ١٣٠٠




| DH.MKT. | 01346.00001 | 2 موحەررەم 1302 |
|---|---|---|

٢ موحەررەم ١٣٠٢
١٠ تشرینی یەکەم ١٣٠٠
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
قـەزای بازیـان سـەر بـە سـانجەقی سـلێمانیە، دەسـتەی حکوومـەت لـە قـەزای ناوهاتـوو هـەر خـۆی مەرکەزەکـەی قـەڵای چەمچەماڵـە لـە کاتـی نیشـتەجێ بوونیـان لـەوێ، لـەم قەڵایـە بـەم دواییـە سـەربازانی شـاهانە نیشـتەجێ بوونـە، فەرمانبەرانـی خۆچێـی بـە پەرشـوبڵاوی لەمێـژە دەسـتیان بـە جێبەجـێ کردنـی ئەرکەکانیـان کـردووە، بـەم حاڵەتـە لـە رووی کارگێریـەوە تێکچـووە، هەروەهـا لەبـەر گرنگـی شـوێنەکە فەرمانبەرانـی خۆچێـی نیشـتەجێ کـراون، سـاڵی ١٢٩٩ سـەرەتایی کانوونـی یەکـەم ئـەو خانـەی کـە بـە کـرێ گیـراوە، مانگانـە لـە جیاتـی کرێیەکـە ١٠٠ قـوروش لـە سـاڵی ٩٩ بـری ئـەو پـارەی کـە دەدرێـت لـە موازەنـەی ئـەم سـاڵە جێبەجـێ دەکرێـت، بـۆ رێکخسـتنی ئـەم زیـادەش رێکخسـتنی بـۆ کـراوە، هەروەهـا لـە مارتـی سـاڵی ٣٠٠ موازەنەکـە تۆمـار دەکرێـت، بـۆ خـەرج کردنـی بـۆ سـەروو نێـردراوە تـا رەزامەنـدی لەسـەر بدرێـت، بـە بریارنامـە لـە بەهیـەی ویلایـەت ئامـاژەی پێکـراوە، لەسـەر ئـەو بریـارەی لـە فەرمانگـەی شـورای دەوڵـەت دراوە، بـە هـەواڵ ناردن لـە سـەدارەتپەناهی جێگیـر کـراوە و لـە نەزارەتـی ژمێریـاری تۆمـار کـراوە، لـەوێ فەرمـان کـراوە هیممـەت بکرێـت لەسـەر جێبەجـێ کردنـی.




<table dir="rtl">
<tr><td>Y.A.RES.</td><td>00034.00001</td><td>28 شەعبان 1303</td></tr>
<tr><td colspan="3">بریارنامە<br>بابی عالی<br>فەرمانگەی ناوەخۆ<br>قەڵەمی نووسین<br>ژمارە ٤١٢<br>بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی<br>راگەیەندراوی بەندەتانە<br>دەستپێك بە فەرمانی پاشا هێنراوەتە دەرسەعادەت، سەبری بەگ لە ناو ویلایەتی موسڵ نووسراو کراوە کە ببێتە قائیمقامی قەزای بازیان، هەروەها داواکاری دراوەتە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران لەوێشەوە پێشکەشی پایەبەرزی سەدارەتپەناهی کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>٢٨ شەعبان ١٣٠٣ و ٢٠ مایس ١٣٠٢<br>نازری کاروباری ناوەخۆ</td></tr>
</table>



Y.A.HUS.00192.00024.001

| Y.A.HUS. | 00192.00024 | 5 رەمەزان 1303 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
تایبەتی
لە ناو ویلایەتی موسڵ قائیمقامیەتی بازیان شوێنەکەی بە تاڵە، بۆ ئەمەش رەزامەندی دراوە لەسەر دامەزراندنی سەبری بەگ، هەر لە کوێ دەدۆزرێتەوە بە لێکۆڵینەوە رابگەیەندرێت، جگە لەمە فەرمان دراوە لەسەر نووسراوی تایبەتی دەوڵەت لێکۆڵینەوە بکرێت و وێنەیەکی ناوبراو بۆ سەروو دەنێردرێت لەگەڵ نووسراوی تایبەتی ئەو فەرمانە پاشاییەی کە راگەیەندراوە دەرکەوتووە، دەستپێك بۆ دەرسەعادەت نێردراوە، هەروەها بە خۆشی ئەمڕۆ لە دەرسەعادەتە، داواکراوە یا ئەوەتا بنێردرێتە مەملەکەتی خۆی یاخود لە ئەرکێك دابمەزرێت، ئەو قائیمقامیەتەی کە باس کراوە رەزامەندی دراوە لەسەر دامەزراندنی تەمەنا دەکەم سەروو رابیگەیەنێت ئەفەندم، لە ٥ رەمەزان ١٣٠٣ و لە ٢٧ مایس ١٣٠٢.
سەدری ئەعزەم


٩٦

i. DH 1106/86619

İ.DH.01106

<table>
<tr><td>I.DH.</td><td>01106.086619</td><td>6 زیلقەعدە 1304</td></tr>
<tr><td colspan="3">٩٦<br>بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی<br>ڕاگەیەندراوی بەندەیە<br>لـە قـەزای بازیـان مەحمـود بکوژی عەلی کوڕی وەتمان دانیشـتووی گوندی سـیدان بە ماوەی ١٥ سـاڵ بە سـزای سـەوڵ لێدان سـزا دراوە، حوکمەکە لە دیوانی عورفیە دراوە لەگەڵ بڕیارنامەکە و کاغەزە جیاجیاکان پێشـکەش کراوە، لە دیوانی ناوهاتـوو بـە بڕیارنامـە باسـکراوە، لەسـەر ڕاگەیەندراوی باسـکراو کاغەزەکان پێشـکەش کراوە، لە هـەر حاڵەتێکدا ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٦ زیلقەعدە ١٣٠٤ و لە ١٥ تەمموز ١٣٠٣.<br>هاوکار و فەرمانبەری چاکسازی</td></tr>
</table>




<table>
<tr><td>DH.MKT.</td><td>01379.00006</td><td>20 سەفەر 1304</td></tr>
<tr><td colspan="3">٢٠ سەفەر ١٣٠٤<br>٥ تشرینی دووەم ١٣٠٢<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>لە نێوان چەمچەماڵ و کەرکووك هۆزی شوان ٣٠ ستونیان دەرهێناوە و دزیویانە، چەند ڕۆژە ناردنی هەواڵ و زانیاری کێشەی بەپەلەی تێکەوتووە، لە باش مودیریەتی تەلەگراف و پۆستەی بەغداد بە تەلەگراف ئاماژەی بۆ کراوە و ڕاگەیەندراوە، ئەوانەی بوێری ئەو کارەیان کردووە هەواڵی پێویست لە بارەیانەوە بدرێت و دەستگیربکرێن، ئەمەش بە نووسراو لە نەزارەتی پۆستە و تەلەگراف ڕاگەیەندراوە، هەروەها بۆ ئەوەی هێڵی تەلەگراف بەم شێوەیە تووشی وێران بوون و دزین نەبێتەوە نەزارەت داوای کردووە، بۆ ئەم مەبەستە کاری پێویست بکرێت، هیممەت بکرێت و لە ئەنجامەکەی ئاگادار بکرێنەوە.</td></tr>
</table>


I.DH 1076/84410

3

İ.DH.01076

| 21 رەجەب 1305 | 01076.084410 | I.DH. |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>بۆ جەنابی ئەفەندم<br>لە ویلایەتی موسڵ سانجەقی سلێمانیە، قائیمقامی قەزای بازیان عومەر ئەفەندی بەهۆی لێنەهاتوویی دوور بخرێتەوە و لە شوێن ئەو لە خانەدانی سلێمانیە سەید حوسێن ئەفەندی دابنرێت، لەسەر راگەیاندنی خۆچێی، بۆ ئاماژە کردن بە پەسەند کردنی ئەرکەکەی نووسراو کراوە، هاوپێچی بریارنامە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران نێردراوەتە قەڵەم، بۆ جێبەجێ کردنیشی نوسراوی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە پێشکەش دەکرێت و رادەگەیەندرێت، بەهەر شێوەیەك بێت فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی چ بفەرمووێت بەپەلە بریارەکە جێبەجێ دەکرێت، نووسراوی راگەیاندن بە ژمارە تۆمار کرا ئەفەندم.<br>لە ٢١ رەجەب ١٣٠٥ لە ٢١ مارت ١٣٠٤<br>سەدری ئەعزەم | | |



| 28 رەبیعی کۆتایی 1305 | 01476.00100 | DH.MKT. |
|---|---|---|
| | | |

راگەیەندراوی بەندەتانە
٢٨ رەبیعی کۆتایی ١٣٠٥
٣١ کانوونی یەکەم ١٣٠٣
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی

ئەو سەرۆکانەی هەمەوەند کە هەڵاتوون، ئەوانەی نێردراونەتە ویلایەتی ئەنقەرە لە ناودارترین سەرۆکەکان پێنج کەسیان لە کاتی بردنیان پارێزگاریان لێ نەکراوە، لەبەر ئەوەی ئاگاداریان نەبوونە، دوای هەڵاتن ئاسایشی ناوچەکەیان تێکداوە و بوونەتە هەڕەشە، ئەم ووتەیە لە موشیرەتی لەشکری شەشەمی هومایۆنی جەلیلە بە تەلەگرافنامە بۆ لایەنی والای سەر عەسکەر نێردراوە، لەو هەمەوەندانە یەك تاقم بۆ فرجەیاب هەڵاتوون، بۆ قەزای باغبان شوێنی پێشووی خۆیان هەڵاتوون، هەروەها یەك چەتەی چەکداریان رێکخستووە و بوێری ئەوەیان کردووە کاری سەرپێچی ئەنجام بدەن، بۆیە پێویستی کردووە لایەنی سەربازی ئامادەکاری بکات، لە ئەنجوومەنی کارگێری سانجەقی سلێمانی بە گوێرەی ئەو تەلەگرافنامەی هاتووە، بۆ لایەنی سەر عەسکەر نووسراوەتەوە تا دەست بە کارەکانی بکات، نابێ رێگە بە ئەوانە بدرێت رابکەن، هەروەها ئەو کەسانەی کە نێردراون، ئاماژە بۆ ویلایەت نێردراوە، بۆ وەڵام تەلەگرافنامە هاتووە، ئەوانەی هەڵاتوون ناویان هاتووە، هێڵی تەلەگراف و پۆستە لەدەستیان بپارێزرێت، بۆ ئەم مەبەستەش تەلەگراف لە نەزارەتی پۆستە لەگەڵ نووسراو لە ١٦ کانوونی یەکەم ١٣٠٢ پێشکەش کراوە، لەم بارەیەوە لە ئەنجوومەنی تایبەتی وەکیلەکان نووسراو رۆیشتووە، بە گوێرەی لێکۆڵینەوەکان دەرکەوتووە، بە تێروانین لە گرنگی و بەرژەوەندی دەوڵەت پەلە بکرێت لە جێبەجێ کردنی.




<table dir="rtl">
<tr><td>DH.MKT.</td><td>01490.00063</td><td>17 جەمادی کۆتایی 1305</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ جەنابی دەوڵەت<br>١٧ جەمادی کۆتایی ١٣٠٥<br>١٧ شوبات ١٣٠٢<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>بۆ قائیمقامیەتی قەزای بازیان بە وەکالەت دامەزراوە، لە ساداتی بەرزنجی حوسێن ئەفەندی داوای کردووە ئەرکەکەی پەسەند بکرێت، ئەو نووسراوەی بۆ جەنابی پاشا ئیسماعیل حەقی نێردراوە، بە نووسراو تەلەگرافنامە بۆ قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران حەواڵە کراوە، لەم بارەیەوە قۆمیسیۆن بۆ یەك ڕۆژیش تۆمار و زانیاری نەبووە، زانیاریەکان بۆ سەروو بە نووسراو باس کراوە، لە بارەی چۆنیەتی ڕاگەیاندن و هەواڵەوە فەرموویەتی هیممەت بکرێت بۆ جێبەجێ کردنی.</td></tr>
</table>


T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
1494 49

DH.MKT.01494.00049.001

| DH.MKT. | 01494.00049 | 2 شەعبان 1305 |
|---|---|---|
| ٢ نیسان ١٣٠٤<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>تەلەگرافنامە<br>بە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا، خانەدانی سلێمانیە سەید حوسێن ئەفەندی لە مێژووی ٢٤ رەجەب ١٣٠٥ لە قەزای بازیان وەکو قائیمقام دامەزراوە. | | |




| 14 رەجەب 1305 | 01497.00010 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٤ رەجەب ١٣٠٥
١٤ مارت ١٣٠٤
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی

لە سانجەقی سلێمانیە قەزای بازیان بۆتە شوێنی خۆحەشاردانی چەتەکانی هەمەوەند، لەبەر ئەوەی قائیمقامی قەزا عومەر ئەفەندی لەگەڵ ئەوەی شوێنەکەی گرنگە کەچی بە گوێرەی پێویست بە ئەرکەکانی هەڵناستێت، بۆیە وا باشترە بۆ شوێنێکی تر بگوازرێتەوە و بۆ شوێنەکەی ئەویش لە خانەدانی سلێمانیە و دڵسۆزی و ئازایەتی تاقیکراوەتەوە، جگە لەوە لێهاتوویی و توانایی پەسەند کراوە، ئەویش سەید حوسێن ئەفەندیە، بۆ ئەوەی بە وەکالەت لە قائیمقامیەت دابمەزرێت، لە ویلایەتی موسڵ تەلەگرافنامە دەرچووە، حەواڵەی قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران کراوە، ئەگەرچی حوسێن ئەفەندی لە تاقمی هوڵبژێردراو نییە، پەسەند کردنی و ئەرکەکەی پێچەوانەی یاسایە، بەڵام لەبەر ئەوەی لە شکست پێ هێنانی چەتەکان گرنگی خۆی دەرخستووە، وا بیراوە لە بەرژەوەندی هەموو لایەکە هەڵبژێردرێت، بۆیە بۆ دامەزراندنی لە قائیمقامیەتی قەزای ناوهاتوو نووسراو کراوە، لە قۆمیسیۆنی ناوهاتوو نێردراوەتە قەڵەم لەوێشەوە بڕیارنامە پێشکەشی جەنابی سەدارەتپەناهی کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی سەروو ئاگادار بکرێتەوە.



| 28 رەجەب 1305 | 01499.00093 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٨ رەجەب ١٣٠٥
٢٨ مارت ١٣٠٤
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی

دەستپێك زانراوە کە هەمەوەندەکان بۆ ئەوێ هەڵاتوون و بەهۆی دووبارەبوونەوەی سنووربەزاندنەکانیان، لەسەر فەرمانی سەدارەتپەناهی ویلایەتی موسڵ ئاگادار کراوەتەوە، ئەمجارەش ویلایەتی ناوهاتوو ئەو تەلەگرافنامەیەی کە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە خوێندویەتیەوە، لەسەر ئەو فەرمانەی کە دراوە، لەگەڵ ئەو ئامادەکاریانەی کە دەکرێت سەرۆکی هەمەوەندەکان مەحمود خضر لەگەڵ ١٢ لە هاوەڵانی بەیەکەوە دێنە موسڵ و لەوێش دەنێردرێنە دەرسەعادەت، ئەوانە لە وەکیلی موتەسەرفی کەرکووك میری لیوا ئەدهەم پاشا پاراونەتەوە و ملکەچی خۆیان راگەیاندووە، هەروەها لەگەڵ سەرۆکەکەی تریان بە گشتی هەموو هەمەوەندەکان بەم نزیکانە چەك دادەنێن و هیواخوازن بەم شێوەیە بێت، بەڵام ئەوانەی ماونەتەوە بەپەلە ملکەچی خۆیان رابگەیەنن، بۆ قەبوڵ کردنی تکا و پارانەوەکانیشیان ٢٠ رۆژ مۆڵەت بدرێت، دوای رازی بوون، فەریقەکەی ئەدهەم پاشا، فرقەی قوماندانیەتی مەرکەزی ویلایەت و بەگی ئالا خەسرەو بەگ پلەکەی بۆ میری میران و سەید حوسێن ئەفەندی لە قائیمقامیەتی بازیان بە وەکالەت نیشانێکی گونجاوی پێ بدرێت، ئەمەش بەهۆی ئەو خزمەتە باشەی کە کردوویانە و پاڵپشتی خۆیان بۆ دەوڵەت نیشان داوە، بۆ جێبەجێ کردنی راوبۆچوونی جەنابی وەکالەتپەناهیە.




| DH.MKT. | 01502.00051 | 8 شەعبان 1305 |
|---|---|---|

شەعبان ١٣٠٥
٧ نیسان ١٣٠٤
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
لە سەرۆکەکانی هەمەوەند مەحمود خضر لەگەڵ ١٢ کەس لە هاوەڵانی بەیەکەوە پاراونەتەوە و ملکەچی خۆیان ڕاگەیاندووە، سەرۆکەکانی تریش بەم نزیکانە خزمەتەکانیان دەبینرێت، لەم ڕووەوە ئەوانەی خزمەت و هەوڵەکانیان بینراوە لەوانە وەکیلی موتەسەرفی کەرکووك ئەدهەم پاشا و بەگی ئالا خەسرۆ لەگەڵ سەید حوسێن ئەفەندی لە وەکالەتی قائیمقامیەتی بازیان لە بارەی پاداشتکردنیان لە ویلایەتی موسڵ تەلەگرافنامە وەرگیراوە و لە ٢٨ مارت ١٣٠٤ پێشکەش کراوە، ئەمجارە لە ویلایەتی ناوهاتوو یەك پارچە تەلەگرافنامە بە داواکردنیەوە ڕاگەیەندراوە و نێردراوە، ئەو تەلەگرافنامەیە خوێندنەوەی بۆ کراوە، دواتر لەسەر فەرموودەی جەنابی وەکالەتپەناهی، لە سەرۆکەکانی ناوهاتوو حەمە مام سلێمان لەگەڵ ١٧ کەس لە هاوەڵانی بەیەکەوە ملکەچی خۆیان ڕاگەیاندووە، هەروەها لەوە زیاتر سەرۆك نەماوە، هەمەوەندەکان دوای ملکەچ بوونی هەموویان دەنێردرێنە دەرسەعادەت، سەبارەت بە پاداشت کردنی ئەوانی تر ئەوا موتەسەرفی سلێمانیە تاهیر بەگیش زیادکراوە، نووسراو کراوە، جێبەجێ کردنی بۆ جەنابی سەدارەتپەناهیە.



| 22 شەعبان 1305 | 01506.00039 | DH.MKT. |
|---|---|---|
| ٢٢ شەعبان ١٣٠٥<br>٢١ نیسان ١٣٠٤<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>لە ناو سانجەقی سلێمانیە بۆ قائیمقامیەتی قەزای بازیان دامەزراوە، سەرەتا بە تەلەگراف راگەیەندراوە، لە خانەدانی سلێمانیە حوسێن ئەفەندی لە مێژووی دەست بە کار بوونی، تا مێژووی ئەو نووسراوانە بە نیوە و دواتر بە تەواوی مانگانە ١٧٥٠ قوروش مووچەی بۆ براوەتەوە، لە مێژووی دەست بە کار بوونی ئەو مووچەی مانگانە وەریدەگرێت بە گوێرەی بڕیارنامە نیوەی مووچەکەی بۆ سندوقی خانەنشینی دەڕوات، بۆ ئەمەش سەروو ئاگادار کراوەتەوە، بە حەواڵە لە ژمێریاری باس کراوە، هیممەت بکرێت بۆ جێبەجێ کردنی. | | |


T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
A.} MKT.MHM
498 70 1

A.}MKT.MHM.00498.00070.001

| 21 ڕەبیعی یەکەم 1306 | 00498.00070 | A.MKT.MHM. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
قەڵەمی نووسین
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
جەنابی دەوڵەت

لە سانجەقی سلێمانیە هۆزی جاف بوونیان هەیە، بە پشت بەستن بە یاساوڕێسا، لەگەڵ قەزاکانی شارەزوور و کەلعەنبەر و بازیان، ناحیەی سەلاحیەش ئەو زەوی و زارانەی پاشا هەیە بە پەرشوبلاوی تێدا نیشتەجێ بکرێن، لە هەموو لایەك سوودی هەیە، بەڵام مەحمود پاشا یەکێك لە میرەکانی هۆزی ناوهاتوو قائیمقامی قەزای کەلعەنبەرە بەهۆی سەرپێچی و زوڵمەکانی هەروەها بە کارەکانی والیەکانی فریو داوە، بۆیە مانەوەی لەوێ گونجاو نییە، بە وەرگرتنی پلەی میری میران ئەوا یا لە موتەسەرفیەتی حەما یاخود ئورفە لە یەکێك لە ئەوانە دادەمەزرێت، لە سانجەقی سلێمانیە دەربچێت و دواتر سەیری ژمێریاریەکەی بکرێت، ئەوە لە ئەستۆیەتی بەرامبەر بە ئەوە دەست بەسەر ئەو مولکەی دابگیرێت کە لەسەر ناویەتی، هەروەها لە شوێن ئەویش عوسمان بەگ برادەری مەحمود پاشا وەکو قائیمقام دابمەزرێت، هەروەها بۆ ناحیەکانی قەزای ناوهاتوو کەسانێك لەلایەن عوسمان بەگەوە دابمەزرێن، لە داهاتووش بۆ دەرهێنانی ئەوانە لەم ناوچانە لە نێوان هومایۆنی باش کیتابەتی جەلیلە بە نووسراوی تایبەتی ١٩ ڕەبیعی یەکەم ١٣٠٦ هاتووە، ڕاگەیەندراوە بە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا و بە نوسراوێکی ئەمر و فەرمانی هومایۆن مەحمود پاشا بۆ موتەسەرفیەت بنێردرێت و دابمەزرێت، پەسەند کراوە و داواکراوە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی، بۆ ئەمەش نووسراو نووسراوەتەوە و ژمارەی پێدراوە بەرێزم.

لە ٢١ ڕەبیعی یەکەم ١٣٠٦ و لە ١٣ تشرینی دووەم ١٣٠٤
سەدری ئەعزەم


DH.MKT.01542.00072.001


DH.MKT.01542.00072.001

| 6 موحەررەم 1306 | 01542.00072 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٦ موحەررەم ١٣٠٦
١ ئەیلوول ١٣٠٤
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی پایەبەرز
شێخ مەعروف نیشتەجێی قەزای مەریوانی ئێران ٢٠٠ خانە لەگەڵ موریدەکانی بۆ ئەم لایەنە هیجرەت دەکەن، داوای کردووە چەند گوندێك لە گوندە وێرانەکان بۆ خۆی دابین بکرێت، جگە لەوانە لە ئێران ٣٠٠ خانەی خەڵك دێن لە ناحیەی قزلجە نیشتەجێ بوونە، ئەم ووتانە لە ویلایەتی موسڵ لەسەر دوو پارچە تەلەگرافنامە کە وەرگیراوە نووسراوە، تا ئێستا ئەو خەڵکەی لە ئێران دێت ئەو هەژمارە پەیوەستە بە چییەوە، لەلایەن ئێوەوە نیشتەجێ بوونە و شێخ مەعروف لەگەڵ زانیاریەکانی بەیەکەوە هاتووە و نەهاتووە وەڵامی ئەم پرسیارانە تێدا ئاماژەی پێکراوە، ئەمجارە ئەوەی لە سەدارەتپەناهی وەرگیراوە، پێشکەش کراوە و راگەیەندراوە، بە خوێندنەوەی تەلەگرافنامە ئەوەی جەنابی وەکالەتپەناهی دەفەرمووێت ئەوەی تا ئێستا لە ئێران دێت برەکەی گەیشتۆتە نزیکەی ٦٠٠ خانە، لەوانەش قەزای شەهربازار و ناحیەکانی قزلجە و ماوەت نیشتەجێ بوونە جگە لە ٣٢٠ خانەی خەڵك لە قەزای بازیانیش نیشتەجێ بوونە، هەمووی دەکاتە ٩٠٠ خانە، دیسان لەلایەکی تر ئاماژە بە هیجرەت کردن کراوە و شێخ مەعروف لە ساداتی بەرزنجیە لەمێژە لەلایەنی ئێران دەست رۆیشتووە، لەگەڵ خۆی جگە لە ئەوانەی ئارەزووی هاتن دەکەن، لە موریدەکان و ئەوانی تر ٢٠٠ خانە زیاترە، ئەوانە شوێنی گونجاویان پێ بدرێت، جگە لەمەش لە موتەسەرفیەتی سلێمانی وا نیشان دراوە کە هەندێك پلەوپایەیان پێ بدرێت، ئەو کۆچکردووانە لە ئەنجامی تکاو پارانەوەیان بۆ سەڵتەنەتی سەنیە پێویستە لە شوێنی گونجاو نیشتەجێ بکرێن و یارمەتی بدرێن، شێخی ناوبراویش داوای کردووە لە دەوروبەری موسڵ لە چەند گوندێکی وێران نیشتەجێ بکرێت، لە ئاماژەی ویلایەت دەرکەوتووە، بۆ جێبەجێ کردنیشی هاوکاری سەروو دەکرێت.



تلغرافنامه

DH.MKT.01545.00085.001

| DH.MKT. | 01545.00085 | 15 موحەررەم 1306 |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

قائیمقامی بازیان سەید حوسێن ئەفەندی خەریکی چاودێری کردنی چەتەکانە، ئێستا ئەو تەلەگرافنامەی کە هاتووە، ئەحمەد تەرشی هەندێك هاوەڵی لە خۆی جیاکردۆتەوە، پێش هەفتەیەك هاتووتە موسڵ لەو کاتەی چەکیان فڕێ داوە، ئەحمەد تەرشی هاوڵاتی ئێرانی حاکیمی بانە یونس خانی لەگەڵ بووە، چۆتە لای و وون بوونە، هەروەها نووسراوەتەوە کاتی داوایان کردوون، نەیانداوە و نیشانیان نەداون، رادەستی ئەو فەرمانبەرانەی ئێمەیان نەکردووە کە لە سەر سنوورن و لەلایەن فەرمانبەرانی ئێرانەوە قەبوڵ نەکراوە، بۆیە هۆکاری دەرکردنیان بۆ باڵیۆزی تەهران نووسراوەتەوە، جگە لەمەش بۆ لایەنی سەرووی فەخامەتیش دەنووسرێتەوە، بە ناردنی هەواڵی بەپەلە جێبەجێ کردنی تکا کراوە، لە ٩ ئەیلوول ١٣٠٤.

فائیق والی موسڵ


OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
1545 108

DH.MKT.01545.00108.001

| 18 موحەررەم 1306 | 01545.00108 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٨ موحەررەم ١٣٠٦
١٢ ئەیلوول ١٣٠٤
بۆ ویلایەتی موسڵ
لە کاتی چاودێری کردنی هەمەوەندەکان ئەوانەی وەرگیراوە و خراوەتە موزایەدەوە هەشت یەکی ئەو ئاژەڵانە فرۆشراوە، بۆ بردنیان و خەرجی ئەوانە لەسەر هەڵاتن و ئاگادارکردنەوە نووسراو لە والاوە هاتووە، لە هەمەوەندەکان فەقی قادر لەگەڵ ئەحمەد لە بازیان ئەو زەوییانەی لە دەستی ئەوانە، کەوتۆتە بارودۆخێکەوە کشتوکاڵی لەسەر ناکرێت، هەروەها ئەو زەوییانەی کە لە هەموو هەمەوەندەکان ماوەتەوە نرخەکەی ٨٤٥٠ قوروشە، بدرێتە ئەوانەی داوای دەکەن، هەروەها لەگەڵ دەستبەسەرکردنی هەمەوەندەکانیش بۆ رەوانە کردنیان دەوڵەت خەرجیەکی زۆری کردووە، لەو خەرجیەیە بەشێکی دراوە، هەروەها ئەو شوێنانەی کە ئەوانەی بۆ رەوان دەکرێت، زەوی گونجاویان پێ بدرێت، بۆ ئەم مەبەستەش لە بارەی فرۆشتنی ئەو زەوییانە بە داواکارەکانیان بە بریاری ئەنجوومەنی تایبەتی وەکیلەکان مۆڵەتی لە سەدارەتپەناهی وەرگیراوە، بە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا هیممەت بکرێت بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی پاشا.



DH.MKT.01548.00031.001

| DH.MKT. | 01548.00031 | 23 موحەررەم 1306 |
|---|---|---|

٢٣ موحەررەم ١٣٠٦
١٨ ئەیلوول ١٣٠٤
بۆ موتەسەرفیەتی بەنغازی و ویلایەتی رۆژئاوای تەرابلۆسی جەلیلە
ئەو هەمەوەندانەی کە بۆ رۆژئاوای تەرابلوس دوورخراونەتەوە، لەوانە حوسێن کاکە مەند کوڕی مەحمود و دوو کەسی تر لە هاوەڵانی رایانکردووە و هاتوونەتە بازیان و لەوێ شەڕیان کردووە، ئەو تەلەگرافنامەیەی هاتووە ئاماژەی پێکراوە، لەم کارە هەندێك لە هەمەوەندەکان بە فیداکاریەوە دەستگیرکراون و نێردراون، رایانکردووە و گەراونەتەوە، ئاژاوەی ئەو هەمەوەندانە بەردەوامە، ئەوانە لەم لایە شەڕ دەکەن، بۆیە پێویستە ناوچەکان ئاگادار بکرێنەوە، بە گوێرەی دەستوور کارەکە جێبەجێ بکرێت و دەستگیر بکرێن.


T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA)

٨٤٥

DH. MKT 1306. S. 4

DH.MKT.01553.00022.001

<table dir="rtl">
<tr><th>DH.MKT.</th><th>01553.00022</th><th>18 موحەررەم 1306</th></tr>
<tr><td colspan="3">٨٤٥<br>لە قەزای بازیان بکوژی گوندنشین عەلی کوڕی وەتمان، دوای لێکۆڵینەوە بکوژ بە ناوی مەحمود بۆ ماوەی ١٥ ساڵ سزا دراوە، سزاکەشی بە سەوڵ لێدان تەواو دەکات، بۆ ئەمەش لە دیوانی جەنگی عورفی بریار دراوە، بریارەکە و بریارنامەکە لەگەڵ کاغەزی جۆراوجۆر نێردراوە، پێشەکی هاوکار و فەرمانبەری چاکسازی جەنابی ئیسماعیل حەقی پاشا لەسەر ئەو نووسراوانەی کە هاتووە، لەگەڵ والای سەر عەسکەر گفتوگۆی کردووە، نووسراوەکەش نێردراوە، یەکسەر لە وەلامەکەشی دا کە بە ئاشکرا روون کراوەتەوە بریاری باسکراو کە لە دیوانی جەنگی دەرچووە یەکسانە بە حوکمی یاسایی کارگێری عورفی ئێرە، ئاماژەی پێکراوە کە جێبەجێ بکرێت، بۆ خوێندنەوە و دەربرینی بیرورا نووسراو کراوە کە هیممەت بکرێت، بۆ ئەمەش نووسراو کراوە و ژمارەی لێدراوە بەرێزم، لە ١٨ موحەررەم ١٣٠٦ و ١٣ ئەیلوول ١٣٠٤.</td></tr>
</table>




| 10 سەفەر 1306 | 01554.00114 | DH.MKT. |
| --- | --- | --- |

١٠ سەفەر ١٣٠٦
٤ تشرینی یەکەم ١٣٠٤
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
لە سانجەقی شارەزوور قائیمقامی قەزای رانیە مەحمود نەدیم ئەفەندی لەسەر دەست لە کارکێشانەوەی لە شوێن ئەو قەزای بازیان عومەر لوتفی ئەفەندی کە لە قائیمقامیەت دابراوە، دامەزرێت، لەسەر ئاماژەی ویلایەتی موسڵ نووسراو کراوە، ئەو داواکاریەی کە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران دراوەتە قەڵەم و کاغەزی وەرگێردراوی زانیاری پەسەندکراوی راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێکردنی ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی سەدارەتپەناهیە.




<table>
<tr><td>18 سەفەر 1306</td><td>01561.00035</td><td>DH.MKT.</td></tr>
<tr><td colspan="3">٢٣ تشرینی یەکەم ١٣٠٤<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>تەلەگراف<br>عومـەر لوتفـی ئەفەنـدی بـۆ قائیمقامیەتـی رانیـە، لـە قائیمقامیەتـی بازیـان جیابۆتـەوە، لـە ١٨ سـەفەر ١٣٠٦ دامــەزراوە.</td></tr>
</table>


DH.MKT.01566.00059.001

| DH.MKT. | 01566.00059 | 16 رەبیعی یەکەم 1306 |
| --- | --- | --- |

١٦ رەبیعی یەکەم ١٣٠٦
٨ تشرینی دووەم ١٣٠٤
بۆ ویلایەتی موسڵ
لە ناو سانجەقی شارەزوور لە قائیمقامیەتی قەزای رانیە دامەزراوە، سەرەتا بە تەلەگراف راگەیەندراوە، عومەر لوتفی ئەفەندی لە قائیمقامیەتی بازیان جیابۆتەوە، هەر لە مێژووی دەست بە کار بوونی تۆمارکراوە مانگانە ١٢٥٠ قوروش مووچەی بۆ دابین دەکرێت، هەروەها تۆمارەکەی رێکخراوە، لەوێ بۆ جێبەجێ کردنی لە مێژووی دەست بەکار بوونی رادەگەیەندرێت و مانگانە ئەو مووچەیەی کە وەریدەگرێت بە پشت بەستن بە بریارنامە نیوەی مووچەکەی بۆ سندوقی خانەنشینی دەروات، بۆ ئەم مەبەستەش لە نەزارەتی ژمێریاری باس کراوە، سەروو ئاگادار بکرێتەوە، بۆ جێبەجێ کردنی هیممەت بکرێت.




| 18 رەبیعی یەکەم 1306 | 01567.00012 | DH. MKT. |
|---|---|---|

١٨ رەبیعی یەکەم ١٣٠٦
١٠ تشرینی دووەم ١٣٠٤
بۆ ویلایەتی موسڵ
لە سانجەقی شارەزوور دیوانی جەنگی عورفی رێکخراوە، هەروەها لەلایەن جەنابی ئیسماعیل حەقی پاشا بە نووسراو نێردراوە، ئەو بریارنامەیەی کە بۆ لایەنی والای سەر عەسکەر رۆیشتووە و لەوێشەوە حەواڵەی کارگێری عورفی دیوانی جەنگی بووە، لە قەزای بازیان، عەلی کوڕی وەتمان گوندنشین لە گوندی سیدان لەگەڵ مەحمود کوڕی محەمەد لە نێوانیان ناکۆکی روویداوە، بەهۆیەوە مەحمود بە بێ مەبەست خەنچەری لە عەلی دەرهێناوە و برینداری کردووە، بەهۆی برینەکەیەوە مردووە، ئەو رووداوە لەسەر ناوهاتووان ساغ بۆتەوە، بەمەش بە گوێرەی یاسانامەی سزای مولکیەی همایۆن ماددەی ١٧٤ دەستەواژەی یەکەم مەحمود دەستبەسەر دەکرێت و لەمێژووی دەستبەسەرکردنیەوە لە ساڵی ١٣٠٣ مایس ٢٩ بە ١٥ ساڵ بە سزای سەوڵ لێدان سزا دەدرێت، ئەم سزایەش دوای وەرگرتنی مۆڵەتی سەدارەتپەناهی مەحمود ماوەی سزاکەی بە هێنانە خوارەوەی ساڵێك بۆ جێبەجێ کردنی بە فەرمانی جەنابی پاشا زانیاری دەدرێتە سەر عەسکەر، بە فەرمان و ئاگاداری سەروو بە ئەمر و فەرمانی همایۆن داواکراوە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.




| DH.MKT. | 01623.00131 | 19 رەمەزان 1306 |
| --- | --- | --- |

١٩ رەمەزان ١٣٠٦
٧ مایس ١٣٠٥
بۆ ویلایەتی موسڵ
لە ماوەی ٣٠ساڵە لە قەزای بازیان لە گوندی هوزلکی بە ئەنجامدانی کشتوکاڵەوە دامەزراوە، لەگەڵ هەمەوەندەکان نزیکایەتی هەیە، بەبێ لێکۆڵینەوە ئەوانی تریش وەکو ئەو بە ماڵومنداڵەوە بەیەکەوە بۆ ئەدرنە نێردراون، بە لێبووردنی بە واژووی سۆفی محەمەد داواکاری دراوە، بە گوێرەی ئەو زانیاریەی لە وەڵامدا هاتووە، نووسراو لە موتەسەرفیەتی بەنغازی هاتووە، لە نێو ئەوەدا بروانامە دۆزراوەتەوە، لە راستییدا ناوبراو لە گوندی ناوهاتوو لەگەڵ ئەوەی بە کشتوکاڵەوە خەریکە تەنیا نزیك بوونەوەی لە هەمەوەندەکان بینراوە، ئەمەش لەم راگەیەندراوە دەرکەوتووە کە نێردراوە، بۆیە ئەمجارە بە گوێرەی لێکۆڵینەوە و ووردبینی لە ویلایەتدا هیممەت بکرێت ئەنجامەکەی رابگەیەندرێت.


Y.PRK.UM.00017.00027.001

| Y.PRK.UM. | 00017.00027 | 14 شەوال 1307 |
| --- | --- | --- |

بۆ هاوکار جەنابی شەهریاری دەرویش پاشا

ئەو هەمەوەندانەی لە ئێرانن ٤١ ئەسپ سواریان بە قەزای رانیە سەر بە سانجەقی شارەزوور تێپەریون و هاتوونەتە ناوچەی گول تەپە لە ناحیەی قەڵای سیوکت لە قائیمقامیەتی بازیان، لەسەر ئاماژەی قائیمقامیەتی قەزای ناوهاتوو لەگەڵ جەنابی قوماندانی پاشا گفتوگۆیان کردووە، هەر ئێستا بۆ چاودێری کردنیان لێرەوە بە هاوەڵی ئاغای تابور مەفرەزەیەکی پۆلیسی پاراستن رێکخراوە، لەگەڵ قائیمقامی قەزا دەرچوونە، لە ناحیەی ناوهاتوو لە گوندی بەید رووبەرووی چەتەکان بوونەتەوە و تا نیوە شەو رووبەرووبوونەوە درێژەی کێشاوە، لە چەتە ناودارەکان براکەی بە ناوی ..... لە مەیدانی شەردا بە کوژراوی کەوتۆتە دەست، سەرە براوەکەی وەرگیراوە و لە چەتەکانیش دوو کەس بریندار بوونە، بەڵام هەڵاتوون، لە سایەی ملوکانە مەفرەزەکەش زیانی گیانی و ماڵی پێنەگەیشتووە، ئێستا ئاغای تابور لەگەڵ قائیمقامی ناوهاتوو تەلەگرافنامە وەرگیراوە و ئاماژەی پێکراوە، لە وەڵامدا نووسراوەتەوە کە لە چاودێریەکانیان بەردەوام بن، فەرمان، لە ٢٤ مایس ١٣٠٦.

بەهرام موتەسەرفی سلێمانیە

Y.PRK.ASK.00060.00098.003

| | | |
|---|---|---|
| Y.PRK.ASK. | 00060.00098 | 4 ڕەمەزان 1307 |

تەلەگرافنامە

حەمە مام سلێمان لە هەمەوەندە لەگەڵ ٢١ ئەسپ سوار لە هاوەڵەکانی لە قەزای چەمچەماڵ سەر بە سلێمانیە، ٣ نەفەری کوشتوە کە ئەو سێ نەفەرە لە پارێزگارەکانی قەڵای چەمچەماڵ کە فەرمانبەرانی پۆلیسن، هەروەها ١٢ تفەنگی بردووە، دیسان لە سلێمانیە لە هۆزی جاف لە فرقەی ئیسماعیل عەزیزی هێرشی کردۆتە سەریان، ١٢ کەسی کووشتووە و بارگیر و بارەکانی تالان کردووە و پێش حەوت هەشت ڕۆژ لە چیای حەمرین هەوڵی داوە لە شوانەکانی میر لیوا کازم پاشا ئاژەڵەکانیان تالان بکات، بۆیە بۆتە شەڕیان، لە بەڕێوەبەرایەتی نیك درە لەسەر ئاماژەی ئەمرۆ ڕاگەیەندراوە.

بۆ جەنابی شەرهریاری من

لە قائیمقامیەتی خانەقین وێنەی تەلەگرافنامە کە بۆ ویلایەتی بەغداد نێردراوە، ڕاگەیەندراوە فەرمان.

١٢ نیسان ١٣٠٦

سەروو




| Y.PRK.ASK. | 00060.00111 | 15 ڕەمەزان 1307 |
|---|---|---|
| بۆ موتەسەرفیەتی کەرکووك<br>ئەو تەلەگرافنامەیەی کە ئێستا لە یوزباشی مەفرەزەی سوارە خەلیل ئاغا وەرگیراوە، پوختەکەی ئەوەیە لە ناو بازیان لە گوندی بادنجان دەرکەوتووە ٦ ئەسپ سوار لە هەمەوەندەکان ڕایانکردووە، هەروەها لەلای تاسلوجەش نەبینراون، زانیاری نییە کە لە کوێ شەڕیان کردووە، یوزباشی زەینەل ئاغاش لە تاسلوجەیە، خۆی دەچێتە سلێمانی بۆ ئەوەی بزانێت و لێکۆڵینەوە بکات لەوەی کە ٢٨ ئەسپ سوار لە کوێن، نووسراو کراوە و زانیاریەکان ڕادەگەیەندرێن.<br>٢٣ نیسان ١٣٠٦ | | |




Y.PRK.ASK.00060.00114.001

| Y.PRK.ASK. | 00060.00114 | 15 رەمەزان 1307 |
|---|---|---|

بۆ قوماندانیەتی کەرکووک

هەواڵ وەرگیراوە کە لە ناو قەزای بازیان چەتەکانی هەمەوەند بوونیان هەیە، بۆیە فەرمان دراوەتە مەفرەزە، ئەمجارە تەلەگراف لە ئێستر سواری یوزباشی فەتاح ئاغا هاتووە، هەمەوەندەکان بە حەوت ئەسپ سوار لە گوندی کوپلە سەر بە بازیان بوونیان هەیە، بە پشت بەستن بەو زانیاریەی کە لەلایەن قائیمقامی بازیانەوە دراوە، بۆ چاودێری کردنیان ڕۆیشتوون، لە لێکۆڵینەوەکان دەرکەوتووە لەو هەشت ئەسپ سوارەی کە ڕۆیشتوون یەك چەتە نەبینراوە، ئەوان گەڕاونەتەوە مەرکەزی قەزا و ئەوە نیشان دراوە، لێرە ئەو لێکۆڵینەوانەی کراوە ئەوە دەرکەوتووە، هەر خۆی وەکیلی قائیمقامی بازیان برادەرزادەی موفتی سلێمانیەیە، ئەوانە هەمیشە نزیکی بەرزنجی و حەفید شێخ سەعیدی ئەفەندین، ئاژاوە دەخەنە گوێچکەی خەڵك و پروپاگەندەی نادروست بڵاودەکەنەوە، بەمەش مەفرەزە دەردەچێت، کەچی یەك شوێنەواری چەتە نابینرێت، یوزباشی ناوهاتوو بە ئاماژەی ئەم کارە داوای وەکیلی قائیمقام ئەرکەکەی بپارێزرێت و هەرچی هەمەوەندەکانە ئێستا لە سنووری ئێرانن، لە کاتی سنووربەزاندنیان ئەوا چاودێری کردنیان دەست پێ دەکاتەوە، ئاسایش بەرقەرار بکرێت، ڕاگەیەندراوە، فەرمان، لە ٢٣ نیسان ١٣٠٦.




Y.PRK.ASK.00062.00065.001

<table>
<tr><td>5 زيلحيجه 1307</td><td>00062.00065</td><td>Y.PRK.ASK.</td></tr>
<tr><td colspan="3">پلەوپايەی سەر عەسکەر<br>قەڵەمی نووسين<br>تايبەتی<br>بـۆ ئـەوەی بچێتـە ڕێـزی هەمەوەنـدەکان ئاغـا حوسـێن ئاغـا کـوڕی عەزيـز لەگەڵ ١٧ لـە هاوەڵانـی لە ناو سـەرچنار لـە گونـدی قـەرە دوغـان، خەرمانـی موفتـی سـلێمانيە و خانـەی چەڵتوکـی قائيمقامـی بازيـان سـەيد ئەفەنديـان سـووتاندووە، بـە ئاماژەی قوماندانيەتـی فرقـەی ١٢ بـە ميهرەبانيـەوە بـە موشـيرەتی لەشکری هومايۆنـی شەشـەم بـە تەلەگرافنامـە ئاماژەی پێکـراوە، ئـەو زانيارييانـەی کـە ڕاگەيەنـدراوە بـە پەلـە جێبەجـێ کـرا، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەيە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ٥ زيلحيجـە ١٣٠٧ و ١٠ تەممـوز ١٣٠٦.<br>سەر عەسکەر</td></tr>
</table>




DH.MKT.01667.00139.001

| | | |
|---|---|---|
| 22 سەفەر 1307 | 01667.00139 | **DH.MKT.** |

٢٢ سەفەر ١٣٠٧
٥ تشرینی یەکەم ١٣٠٥
بۆ ویلایەتی موسڵ
لە لکێنراوەکانی قەزای بازیان گوندی مورتکە بە تاپۆ لە ژێر دەستی دایە، لەبەر سنووربەزاندنەکانی هۆزی هەمەوەند شوێنەکە خراوەتە موزایەدەوە بۆ ئەوەی ڕێگری لەم موزایەدە بکرێت، سۆفی مەحمود بە واژوو داواکاری بەرز کردۆتەوە، لە وەڵامی ئەو ئاماژەی کە پێشووتر نێردراوە، بە تێروانین لە نووسراو مێژووی ٩ ئەیلوول ١٣٠٥ کە هاتووە، لە سەرۆکە ناودارەکانی هەمەوەند سەلیم خەسرەو هەروەها برادەری ئەحمەد ترشییە کە ماوەیەك پێش ئێستا کوژرا، ئەمرۆ دەرکەوتووە کە ناتوانرێت کارە چەتەگەریەکانی بوەستێنرێت، ئێستا سۆفی مەحمود ئەگەر لە هەر شوێنێك بێت داوای کردووە پارێزگاری لێ بکرێت و ئاگاداری بن.

| DH.MKT. | 01680.00004 | 15 ڕەبیعی کۆتایی 1307 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دادوەری جەلیلە
بریکاری قائیمقامی بازیان سەید ئەحمەد ئەفەندی دەستی لە کار کێشاوەتەوە، هەروەها ئەو تابورەی لێرەیە لە بارەی پاراستنی گیان و ماڵ و دڵسۆزیەکەی گەواهیدەری کارەکانیەتی، میر ئالای ئیسماعیل بەگ لە سلێمانی دامەزراوە بەو مەرجەی لێکۆڵینەوە بکرێت، تا بزانرێت لەم قەزایە بردنی ١٠٠ هەزار قوروش لە پارەوپولی میری چۆن بووە و سەبارەت بە تاوانبار کردنی دانیشتووان و گرتنی ئەوانەی تاوانبار و ئەوانەی تاوانبار نین بە گوێرەی نیزام دەستگیر بکرێن و بۆ ڕاست کردنەوەی ئەو بابەتە بەڵێن دەدەم.
عەبدوڵڵا باش کاتیبی سەرەتایی بازیان




| DH.MKT. | 01681.00041 | 18 رەبیعی کۆتایی 1307 |
|---|---|---|
| ١٨ رەبیعی کۆتایی ١٣٠٧<br>٣٠ تشرینی دووەم ١٣٠٥<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>لەبەر ئەوەی ئاشکرا بووە کە ١٠٠ هەزار قوروشی دزیوە، عەبدوڵلا باش کاتیبی دادگای سەرەتای قەزای بازیان تەلەگرافنامەی ناردووە، وێنەیەکی نێردراوە، بۆ تێروانین لە چۆنیەتی کارەکە راگەیەندراوە هیممەت بکرێت بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت. | | |




| DH.MKT. | 01711.00114 | 6 شەعبان 1307 |
|---|---|---|

٦ شەعبان ١٣٠٧
١٥ مارت ١٣٠٦
بۆ ویلایەتی رۆژئاوای تەرابلوسی جەلیلە و موتەسەرفیەتی بەنغازی
گوندی مورتکە سەر بە قەزای بازیان هەروەها بە تاپۆ لە ژێر دەستی ئەو دایە بەرێوەی دەبات، ئەو مولکە بەهۆی دوژمنایەتی هۆزی هەمەوەند خراوەتە ژێر زیادکردنەوە، بۆ رێگری کردن لەم زیادکردنە، سۆفی مەحمود داواکاری بە واژووی خۆی پێشکەش کردووە، بە گوێرەی ئەو لێکۆڵینەوەی پێشووتر کراوە لە وەڵامدا هاتووە، هەروەها نووسراو لە ویلایەتی موسڵەوە هاتووە، لە سەرۆکە بەناوبانگەکانی هەمەوەند سەلیم خەسرەو هەروەها چەند رۆژ پێش ئێستا کوژراوە دەکاتە برادەری ئەحمەد ترشی، ئەمرۆ لە ناو لیوا بەنغازی لە قەزای درنە بیزاوە، ئەوانەی لە بەنغازی رایانکردووە، لە ووتەکانی دەرکەوتووە، ئەوە و هەمەوەندەکانی تر لە پێشتر زیاتر پێویستە پارێزگاریان لێ بکرێت، هەروەها ئەوانە بە هۆی چەتەگەریەوە بۆ ئەوێ دوور خراونەتەوە، رێگە دان بە هەڵاتنیان رێگەپێدراو نییە، فەرمانی پاراستنیان پێویستی بە وریایی و چاودێریە، هەروەها ئەو ئەرکە لە حکومەت ئاگاداری دراوەتە ویلایەتی رۆژئاوای ترابلوس، فەرمانی پاراستنی ئەوانە پێویستی بە هەوڵی زیاترە، بۆیە هیمەت بکرێت، جگە لەوە بۆ موتەسەرفیەتی ناوهاتوو ئاگاداری نێردراوە، ئەو هەمەوەندانەی لە ویلایەتی جەلیلە بوونیان هەیە، پێویستی بە هەوڵی زیاترە تا رێگە نەدرێت رابکەن بۆ ئەمەش داوای هیمەت کراوە.




Y.PRK.UM 18/55

Y.PRK.UM.00018.00055.003

| Y.PRK.UM. | 00018.00055 | 7 موحەررەم 1308 |
| --- | --- | --- |

پایەی سەرعەسکەر
قەڵەمی نووسین
تایبەتی
لە ٢٦ تەمموز ئەو مەفرەزانەی خەریکی چاودێری بوونە، لەگەڵ چەتەکانی هەمەوەند رووبەرووی یەکتر بوونەتەوە، لە چەتەکان ١ نەفەر کوژراوە، ٢ نەفەریش بریندار بووە، هەروەها لە خۆشیان برێك تفەنگی مارتینی لەگەڵ ٢٠ سەر ئاژەڵ وەرگیراوەتەوە، هەروەها لەم رووبەرووبوونەوە تەنیا پێنج ئاژەڵی مەفرەزەکە لەناوچوون، لە ویلایەتی موسڵ لە نێوان مەفرەزەی پۆلیس و چەتەکانی هەمەوەند ئەو رووبەرووبوونەوەی روویداوە، لە چەتەکان ٤ نەفەر بریندار بووە، ٣ ماییینیش لەناوچوون، هەروەها پیاوی قائیمقامی بازیان بریندار بووە، جگە لەمە لە پۆلیسەکانیش ئاژەڵی یەکێکیان مردووە، لەلایەن مەفرەزەی سوارە ئەو چاودێریەی کە کراوە لە تەلەگرافنامەکانی موشیرەتی لەشکری شەشەمی هومایۆن دەرکەوتووە، لەسەر فەرمانی سەروو زانیاریەکان راگەیەندراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٧ موحەررەم ١٣٠٨ و ١١ ئۆغستۆس ١٣٠٦.
سەرعەسکەر




موصل ولایتندن وارد

Y.PRK.UM 20/16

Y.PRK.UM.00020.00016.001

| | | |
|---|---|---|
| Y.PRK.UM. | 00020.00016 | 9 جەمادی یەکەم 1308 |
| لە ویلایەتی موسڵ هاتووە<br>بەهـۆی رەسـەنایەتیەکەی سـەید ئەحمـەد ئەفەنـدی لـە داواکاریەك نـووسراوە کە لـە قائیمقامیەتی بازیـان دابنرێت، لـە داواکاریەکـە دوو ئامانـج دەسـت نیشـان کـراوە یەکـەم پێشکەشـی نەزارەتـی ناوەخـۆ کـراوە، هەروەهـا ئەمجارە لێکۆڵینـەوەی لەسـەر کراوە، پەسـەندکردنی رەسـەنایەتی کـردووە، فەرمان.<br>لە ٩ کانوونی یەکەم ١٣٠٦<br>تاهیر والی ویلایەتی موسڵ | | |


Y.MTV.00049.00113.001



| Y.MTV. | 00049.00113 | 20 رەمەزان 1308 |
| --- | --- | --- |

موشیری پاشای بەندە خەریکە دەگاتە موسڵ، هەمەوەندەکان بە شێوەیەکی کاتی ملکەچبوونیان قەبوڵ کراوە، لەگەڵ ئەوەش لە ژێر نەزارەتی حکوومەت دەمێننەوە، ئەمەش کاری باشی زۆر بەدوا دادێت هەروەها ئەگەر ئەم کارە درێژە بکێشێت ئەوا گونجاو نابێت، بە ملکەچبوونیان چەکەکانیان کۆدەکرێتەوە، بەمەش مۆڵەت دراوە ئەدهەم پاشا قوماندانی کەرکووك بەرەو چەمچەماڵ بڕوات، ئەمەش لەگەڵ داواکاری من لە ٢٣ مارت ١٣٠٧ ڕاگەیەندرا بوو، بەم پێیە فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی بە سەدارەت ڕاگەیەندراوە، بەڵام لە بارەی ڕۆیشتنی هیچ ڕاستییەك نییە، هەروەها لە بابی عالی فەرمانی پاشا ڕاگەیەندراوە، جێبەجێ کردنی حوکمەکەشی لاری بوونی تێدایە، بۆیە ڕۆیشتنی بۆ چەمچەماڵ وەستێنراوە، بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی جموجۆڵەکەی ئەمجارە بەندەی ناوبراو لە تەلەگرافنامەی شیفرە هاتووە وێنەیەکی هاوپێچ پێشکەش کراوە، بە تێروانین لە هەواڵگری وا دەرکەوتووە بەندەی پاشای ناوبراو فەرمان دراوە ڕاستەوخۆ بچێتە بەغداد، بەڵام مادەم هەمەوەندەکان بیرۆکەی ئەوەیان هەیە ملکەچ بوونی خۆیان ڕابگەیەنن، بۆ ئەوەی نکۆڵی لەم بیرۆکەیە نەکەن ئەدهەم پاشا مۆڵەتی پێ بدرێت بچێتە چەمچەماڵ یاخود لەلایەن بەندەی پاشای سەر عەسکەر ئاگادار بکرێتەوە، لە هەر حاڵەتێکدا هاوکاری جەنابی شاهنشای جەلیلە هەبێت، ئەمر و فەرمان فەرمانی جەنابی ئەفەندیمانە، لە ١٧ ڕەمەزان ١٣٠٨ و لە ١٤ نیسان ١٣٠٧.

بۆ ئەم کارە لە کاتی ڕاگەیاندنی سەروو بۆ ڕۆیشتنی ئەدهەم پاشا بۆ چەمچەماڵ لەلایەن جەنابی خەلافەتپەناهی بە فەرمانی پاشا ئاگاداری دراوەتە فەرمانگەی سەربازی تا لەلایەن سەر عەسکەرەوە مۆڵەتی ڕۆیشتنی پێ بدرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٠ ڕەمەزان ١٣٠٨ لە ١٧ نیسان ١٣٠٧.

جەنابی شەهریاری سەر کاتیب

| MV. | 00063.00088 | 19 شەعبان 1308 |
|---|---|---|

١٩ شەعبان ١٣٠٨
١٨ مارت ١٣٠٧
پوختەی دارایی
لـە بـارەی قەبـوڵ کردنـی ملکەچبـوون و تـکای چەتەکانـی هەمەوەنـدە بـۆ بەپەلـە جێبەجـێ کردنـی کارەکانیـش لـە ویلایەتـی موسـڵ دوو پارچـە تەلەگرافنامـە هاوپێـچ بـە تێروانیـن لـە زانیاریـەکان لـە بـارەی مامەڵـەی ئەوانـە، لـە نەزارەتـی ناوەخـۆ نـووسراو کـراوە، بـە هاتنـی ئەنجامـی نوسراوەکـە ئەگەرچـی دووبـارە فرقەیەکـی چاکسـازی بـۆ ئـەوێ دەنێردرێـت، ئەمجـارە بـە قەبـوڵ کردنـی تکاکانیان بـە گوێرەی ئـەو تکایانە لە شـوێنەکان نیشـتەجێ دەکرێن، بـە هاتنـی نـوسـراو لـە ویلایـەت بـە گوێـرەی وەڵامـی ئـەو نـووسراوەی کە هاتـووە لە والـی ویلایەتـی ناوهاتـوو ئەو تەلەگرافنامەیـەی کـە بـۆ سـەدارەت دەروات هێشـتا خوێندنـەوەی بـۆ دەکرێـت.

بریار
لـە تەلەگرافنامـەدا هاتـووە بـۆ نیشـتەجێ کردنـی هەمەوەنـدەکان لـە ناحیـەی مەلحـە گونجـاو نییـە، وا گونجاوتـرە لـە قـەزای بازیـان سـەر بـە سـانجەقی سـلێمانیە نیشـتەجێ بکرێـن، بـەم شـێوەیە ئەوانیـش بە ئەوپـەڕی سوپاسـەوە قەبوڵـی دەکـەن، سـەرەتا ئـەو تەلەگرافنامـەیـەی بـۆ نەزارەتـی ناوەخـۆ نێـردراوە، هۆکارەکانـی قەبـوڵ کردنـی تـکای ئەوانـە بـاس کـراوە، هەرچـی زووە ڕەزامەنـدی بدرێـت لەسـەر جێبەجـێ کردنـی کارەکـە، هەروەهـا بـە تێروانیـن لـە ئاماژەکان ناوبـراوان چەکەکانیـان رادەسـت دەکەنـەوە، فەرمانـی نیشـتەجێ کردنیشـیان پەیوەسـت دەبێـت بـە بەرقـەرار بوونـی ئاسـایش و جێگیـر بوونـی ئەمنیـەت، بـۆ بەرقەرارنەبوونـی ئەوانـەش بـە تەواوەتـی ناکرێـت، تـکای ئەمجارەیـان لـە ئەنجامـی چاودێـری کردنیـان بـە فەرمـی ئەنجام بدرێـت، لەگـەڵ قەبوڵ کردنـی تکایان سـەبارەت بە نیشـتەجێ کردنیـان لـە دەوروبـەری قـەزای بازیـان لە گونـدی دیاریکـراودا بـە بڕیارنامـە ڕاگەیەنـدراوە و ڕەزامەندی دراوە، کـراوە بـە بڕیـار.

| | | |
|---|---|---|
| MV. | 00065.00007 | 3 سەفەر 1308 |

٣ سەفەر ١٣٠٨
٢٩ مایس ١٣٠٧
پوختەی دارایی

هەمەوەندەکان لە شەش هۆز پێکهاتوون، لە هەر یەکەیان یەك کەس بە شێوەیەکی هەمیشەیی وەکو کەفیل لە کەرکووك نیشتەجێ بکرێن، لەگەڵ قەبوڵ کردنی ملکەچ بوونیان لە قەزای بازیان نیشتەجێ بکرێن، بۆ ئەمەش پێویست بە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا دەبێت هەروەها خەرجی پارە لە ویلایەت رێك دەخرێت، جگە لەوە ناوبراوان پێویستیان بە بری چەند دانەوێڵە هەیە، بە راگەیەندراوێك ویلایەتی موسڵ ئاگادار کراوەتەوە، بەرپرسەکانی ناوبراوان هاتوونەتە کەرکووك لەگەڵ ئەو شەش کەسەش ئەوانەی لەگەڵیان هاتوون لە نیشتەجێ کردنیان لە گوندەکان بۆ بەرێوەبردن و دانەوێڵە بە گوێرەی پێداویستی خۆیان بۆیان دابین دەکرێت، بە تەخمینی ٦٠٠٠ قیە گەنم و ٣٠٠٠٠ قیە جۆ بە رێکخستنی ٢٧٠٠٠ قوروش دابین دەکرێت، جگە لەوە بۆ ئەو شەش سەرۆکە بۆ هەر یەکەیان ١٠٠٠ قوروش مووچەیان پێ بدرێت، هەروەها لە کەرکووك لەو فەرمانبەرە سەرۆکانەی کە لە کورکووك نیشتەجێ دەکرێت رەشید حەیدەر بە وەرگرتنی رەزامەندی لە سلێمانیە بە ئاغای بلۆکی پۆلیس دەستبەکار دەبێت، لە کەسوکارەکانیشی ١٠ کەس دەخرێنە ناو سلکی پۆلیسی، هەروەها سەرۆکی فرقەکەی تری هەمەوەندەکان حوسێن عەزیز ئاغا، وەکو ئاغای بلۆکی پۆلیس و یاریدەدەری ئاغای بلۆك دادەمەزرێ، لە وەڵامدا تەلەگرافنامە لە ٢٧ مایس ١٣٠٧ هاتووە و خوێندنەوەی بۆ کراوە.

بریار

بە تێروانین لە وێنەی ئاماژە پێکراوەکە ئەو زەخیرەیەی باسکراوە هەشت یەکی دەکاتە ٢٠٠٠٠ قوروش پارە، لە ویلایەت رێك دەخرێت، جگە لەوەش بۆ سەرۆکەکانیش هەر یەکە ١٠٠٠ قوروش مووچەیان بۆ دابین دەکرێت، هەروەها لە بارەی دامەزراندنی ئاغای بلۆك و یاریدەدەرەکانی و دامەزراندنی ١٠ کەس بە گونجاو زانراوە وەکو پۆلیس دابمەزرێن، هەروەها سوودەکانی بینراوە، بۆیە جێبەجێ بکرێت و بە بریارنامە مۆڵەتەکەی کراوەتە بریار.




| Y.PRK.ASK. | 00065.00100 | 21 سەفەر 1308 |
|---|---|---|

شیفرەی قوماندانیەتی کەرکوك هاتووە

لە سلێمانیە بۆ چەمچەماڵ لەوێشەوە بۆ کەرکووك هاتوون، میر ئالای رەدیف و کاتیبی ئالای و یوزباشی نیزامیە و گەشتیاری ئێرانی و کاروانی سلێمانیە لەگەڵ تابور ئاغای سلێمانیە کە لە ٤١ سوارە و ١٧ پیادەی پۆلیس و ٧ سوارە لە سەربازی شاهانە پێك دێن بەیەکەوە بوونە لە دەوروبەری گوندی قەرە هەنجیر نزیکەی ٦٠ تا ٧٠ چەتەی هەمەوەند بە رێکەوت تووشی یەکتر بوونە هەروەها لەو رۆژە ئەو کاروانە تابور ئاغاکەی یەکسەر بە هەڵاتن گەراوەتەوە چەمچەماڵ ئەوانەی بەرگریشیان کردووە تووشی حەپەسان بوونە، بەم شێوەیە هەواڵیان ناردووە، جگە لەوەش مەفرەزەیەکی تر لە ژێر دەستیان نەبووە، پۆستە نێردراوە ئەوەی لە دەست دێت سوارە و ئێستر سوارەی سەربازی شاهانە و لە فەرمانبەر نزیکەی ٤٥ پۆلیس هەر ئێستا بنێردرێت، لەگەڵ گەیشتنی ئەوانیش سەرەتا چەتەکان بەشەرەوە پارەوپول و کەلوپەل و ئاژەڵیان دەست کەوتووە، لەم رووبەرووبوونەوە لە بریندار بوون جگە لە چەتەکان ٣ کوژراو هەیە، ئەوانەی ئەو سوارانەی بۆ تاقیکردنەوە هاتوون لەگەڵ باش چاوش، لە سوارەکان ٣ کەس شەهید بوونە، هەروەها لەگەڵ یوزباشی ناوبراو برینداریکیش هەیە، لە خەڵکی پۆلیس و گەشتیار و کاروان چەند کوژراو و برینداریك هەیە، ئەوەی لەم ناوە ماوەتەوەش لە چەمچەماڵ و گوندەکانی چواردەوری ئاشوریەکان ئەو ئاژەڵ و کەلوپەلانەی کە پەرشوبلاوبوونەوە کۆیان کردۆتەوە، قائیمقامی سوارە تۆفیق بەگ و مەفرەزەی ئێستر سوار گەراونەتەوە چەمچەماڵ، خۆیان بۆ چاودێری کردن چووبوونە ئەو شوێنە، شەش کاتژمێر پۆستەکەیان دواکەوتووە، لە دەرکەوتنی پۆستەکە ئەمانە راگەیەندراوە، فەرمان، لە ٢٤ ئەیلوول ١٣٠٦.

فەریق ئەدهەم قۆماندانی فرقەی ١٢


İ.DH 1212/94960

İ.DH.01212

| .I.DH | 01212.094960 | 27 جەمادی کۆتایی 1308 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
بۆ جەنابی ئەفەندیم
لـە قـەزای بازیـان سـەر بـە سـانجەقی سـلێمانیە بەهـۆی مردنـی قائیمقـام سـەید حوسـێن ئەفەنـدی، لـە شـوێن ئەو لـە وەکالەتـی قائیمقامـی مەجیدیـە جیابۆتـەوە، هەروەها سـەبارەت بـە دامەزراندنـی ئیبراهیم بەگ هەڵبژێـردراو لە چینـی سـێیەم نـووسراو کـراوە و لە قۆمیسـیۆنی هەڵبژاردنـی فەرمانبـەران بریارنامە دەرچـووە، کاغەزی وەرگێـردراوی کەسێتیشـی لەگـەڵ نـووسراوی نەزارەتـی ناوەخـۆی جەلیلە راگەیەندراوە و پێشـکەش کـراوە، بە هەر شـێوەیەك بێت ئەمـر و فەرمانـی پاشـای جەنابـی پاشـا چ بفەرمویـت جێبەجـێ دەکرێت، نـووسراو ژمارەی لەسـەر نووسراوەتـەوە، لە ٢٧ جەمـادی کۆتایـی ١٣٠٨ و ٢٦ کانوونـی دووەم ١٣٠٦.

سەدری ئەعززەم




<table>
<tr><td>DH.MKT.</td><td>01801.00058</td><td>9 جەمادی کۆتایی 1308</td></tr>
<tr><td colspan="3">٩ جەمادی کۆتایی ١٣٠٨<br>٨ کانوونی دووەم ١٣٠٦<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>قائیمقامی پێشووی قەزای دهۆك عومەر لوتفی ئەفەندی لەبەر ئەوەی لە قائیمقامیەتەکانی بازیان و رانیە بووە، پێویستی کردووە بریارنامەی پاکانەی بۆ بنێردرێت، بە هەنگاو ئاماژەی پێکراوە، بەڵام تا ئێستا نەنێردراوە، بۆ دڵنیابوونەوە، ئەمجارە داواکراوەتەوە، بەپەلە جێبەجێ بکرێت، بۆ ئەم مەبەستە داواکراوە هیممەت بکرێت.</td></tr>
</table>



DH.MKT.01802.00011.001

<table>
<tr><td>DH.MKT.</td><td>01802.00011</td><td>13 جەمادی کۆتایی 1308</td></tr>
<tr><td colspan="3">١٣ جەمادی کۆتایی ١٣٠٨<br>١٢ کانوونی دووەم ١٣٠٦<br>جەنابی سەدارەتپەناهی<br>لە ناو سانجەقی سلێمانیە، قائیمقامی قەزای بازیان سەید حوسێن ئەفەندی بەهۆی مردنیەوە بە وەکالەت سەید ئەحمەد ئەفەندی خراوەتە شوێنی ئەمەش لە ویلایەتی موسڵ ئاماژەی پێکراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی لە تاقمی هەڵنەبژێراوەکانە، بۆیە ئیبراهیم بەگ لە چینی دووەم دامەزرێت بۆ ئەمەش نووسراو کراوە، لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران دراوەتە قەڵەم، بریارنامە لەگەڵ کاغەزی وەرگیراوی زانیاری بەیەکەوە پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنیشی پێویستی بە هاوکاری سەدارەتپەناهییە.</td></tr>
</table>



| | | |
|---|---|---|
| DH.MKT. | 01808.00086 | 3 رەجەب 1308 |

٣ رەجەب ١٣٠٨
٣١ کانوونی دووەم ١٣٠٦
بۆ ویلایەتی موسڵ
قائیمقامی قەزای بازیان ساڵەکانی ١٣٠٥ و ١٣٠٦ لە داهاتی مەعاریف ١٢٠٠٠ قوروشی خستۆتە سەر هەژماری خۆی، بە چەند جارێك داوا کراوەتەوە، بەڵام نەیگەراندۆتەوە، ئەمەش لە بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی موسڵ ڕاگەیەندراوە، لە نەزارەتی مەعاریفی جەلیلەش ئاماژەی پێکراوە کە برە پارەی باسکراو هەر ئێستا لەگەڵ خودی خۆی بەیەکەوە چۆنیەتی مامەڵەی یاسایی لەسەر جێبەجێ بکرێت، بە لێکۆڵینەوە هیممەت بکرێت لەسەر چارەسەرکردنی.




DH.MKT.01813.00006.001

| 17 ڕەجەب 1308 | 01813.00006 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٧ ڕەجەب ١٣٠٨
١٤ شوبات ١٣٠٤
بۆ ویلایەتی موسڵ
لە ناو سانجەقی سلێمانیە بۆ قائیمقامیەتی قەزای بازیان دامەزراوە، سەرەتا بە تەلەگرافنامە هەواڵ نێردراوە، هەر کە ئیبراهیم بەگ گەیشتە شوێنی مەبەست لە مێژووی دەست بەکاربوونی بە بڕیاری حوکمەکەی مانگانە ١٧٥٠ قوروش مووچەی بۆ دەبڕێتەوە، هەروەها نووسراوەکەشەی ڕێکخراوە، لەوێ لەگەڵ جێبەجێ کردنی لە مێژووی ناوهاتووەوە پشت بەستن بە ڕاگەیاندن و بڕیارنامە ئەو مووچەی کە مانگانە وەریدەگرێت نیوەی بۆ خانەنشینی دابین دەکرێت، لە ١٠٪ ی دەنێردرێتە قۆمیسیۆنی سندوقی ئاگرکوژێنەوە، هەرچی خەرجی ڕێگای ناوبراوە ٣١٦٢ قوروشە ئەویش لە پارەوپولی خۆچێی وەریدەگرێت، لە خشتەی خەرجیش نووسراوەتەوە و لە سەروو نووسراوەتەوە و لە ژمێریاری باسکراوە، هیممەت بکرێت بۆ جێبەجێ کردنی.




| 10 شەعبان 1308 | 01820.00063 | DH.MKT. |
| --- | --- | --- |
| ١٠ شەعبان ١٣٠٨<br>٩ مارت ١٣٠٧<br>بۆ ویلایەتەکانی بەغداد و موسڵ و دیاربەکر<br>لـە هـۆزی جـاف نزیکـەی ٢٠٠٠ خانـەی خەڵـك هـەوڵ دەدرێـت بگوازرێتـەوە قـەزای بازیـان و نیشـتەجێ بکرێـن، لەگـەڵ هاتنـی ئـەم هەواڵـە داوا کـراوە یارمەتـی ئەوانـە نەدرێـن کـە دێنـە ئـەوێ، بـە چەنـد واژوویەك لـە مەرکەزی چەمچەمـاڵ تەلەگرافنامـە دەرچـووە، هاوپێـچ نێـردراوە، چۆنیەتیەکەشـی بـۆ ویلایەتـی موسـڵ و دیاربەکـر نـووسرا کراوە. | | |




| DH.MKT. | 01824.00113 | 22 شەعبان 1308 |
| --- | --- | --- |

٢٢ شەعبان ١٣٠٨
٢٠ مارت ١٣٠٧
بۆ ویلایەتی موسڵ
لە قائیمقامی قەزای بازیان ئیبراهیم بەگ دامەزراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی راگەیەندراوە کە ناتوانی کارگێری قەزا بەڕێوە ببات، بۆیە بە پێویست زانراوە قائیمقامی پێشوو سەعید ئەفەندی لە شوێن خۆی بمێنێتەوە، بۆ ئەمەش لە مێژووی ١٠ مارت ١٣٠٧ لە ویلایەت تەلەگرافنامە نێردراوە، ئەگەرچی لە ویلایەت بەم شێوەیە ئاماژەی پێکراوە، بەڵام لەم جۆرە شوێنانە بە گوێرەی ئەزموون دەرکەوتووە کە قائیمقامەکان لە بەڕێوەبردنی کارگێری ناوچەکە سەرکەوتوو نابن، هەروەها لەبەر ئەوەی ئیبراهیم بەگ دامەزراوە، لە کارەکەی سەرکەوتوو دەبێت و کاروباری قەزا بەباشی بەڕێوە دەبات، بۆیە لەم بارەیەوە هیمەت بکرێت.




Y.PRK.ASK.00077.00111.001

| Y.PRK.ASK. | 00077.00111 | 28 زیلحیجه 1309 |
|---|---|---|

پلەوپایەی سەرعەسکەر
قەڵەمی نووسین
تایبەتی
تەلەگرافنامە لە موشیرەتی جەلیلەی لەشکری شەشەمی هومایۆن لە قەزای بازیان بەهۆی ناسکی شوێنەکەی لەگەڵ ویلایەتی موسڵ لە قوماندانیەتی فرقەی ١٢ بە پێویستی زانیوە لە چەمچەماڵ ئالای ٤٦ تابوری دووەم یەك یوزباشی و دوو مولازم لە قوماندانی ٥٧، یەك بلۆك نێردراوە، بەم ئاماژەپێکردنەی سەروو، زانیاریەکان راگەیەندراون، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە کۆتایی زیلحیجە ١٣٠٩ و لە ١٢ تەمموز ١٣٠٨.

سەرعەسکەر



| | | |
|---|---|---|
| 6 جەمادی یەکەم 1309 | 01898.00094 | DH.MKT. |

٦ جەمادی یەکەم ١٣٠٩
٢٦ تشرینی دووەم ١٣٠٧
بۆ ویلایەتی موسڵ
قائیمقامی قەزای بازیان لە ساڵەکانی ١٣٠٥ و ١٣٠٦ لە داهاتی مەعاریف ١٢٠٠٠ قوروشی خستۆتە سەر هەژماری خۆی، لەگەڵ داهاتی خۆی بەیەکەوە بۆ جێبەجێ کردنی مامەڵەی یاسایی لە سەر ئاماژە پێکردنی نەزارەتی مەعاریفی جەلیلە لە مێژووی ٣١ کانوونی دووەم ١٣٠٦ بۆ واڵا راگەیەندراوە، ئەو برە پارەیەی کە وەریگرتووە نەیناردۆتەوە، ئاقچەی باسکراو کە خراوەتە سەر هەژماری قائیمقامی ناوبراو بە هەر بۆنەیەکیش بێت خەرج کردنی لە یەکێکی تر راگەیەندراوە لە بەرامبەر ئەوەدا دەبێ سزا بدرێت، ئەمجارە لە نەزارەتی ناوهاتوو ئاماژەی پێکراوە، لەسەر ئاماژەی پێشووش بە لێکۆڵینەوە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردن و راگەیاندنی.



| 12 جەمادی یەکەم 1309 | 01901.00030 | DH.MKT. |
|---|---|---|
| ١٢ جەمادی یەکەم ١٣٠٩<br>٢ کانوونی یەکەم ١٣٠٧<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>عومەر لوتفی ئەفەندی لە قائیمقامیەتی دهۆك دەستی لە کار کێشاوەتەوە، ئەو داواکاریەی کە بۆ سەروو نێردراوە لەساڵی ١٣٠٢ کاری کردووە، بۆ ئەوەی لە قائیمقامیەتی قەزای بازیان دەست بە کار بێت لە داواکاریەك داواکراوە پاکانەی ئەستۆکەی لە ویلایەت پەسەند بکرێت و بنێردرێتەوە، هیممەت بکرێت بۆ جێبەجێ کردنی. | | |






DH.MKT.01905.00077.001

<table>
<tr><td>DH.MKT.</td><td>01905.00077</td><td>26 جەمادی یەکەم 1309</td></tr>
<tr><td colspan="3">٢٦ جەمادی یەکەم ١٣٠٩<br>١٦ کانوونی یەکەم ١٣٠٧<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>قائیمقامی بازیان کارە خراپەکانی پەسەند کراوە، بەهۆی مانەوە و دوورنەخستنەوەی لە خانەدانەکان عەبدولقادر و ئەوانی تر واژوویان کردووە و تەلەگرافنامەیان بۆ سەدارەت و نەزارەت ناردووە، لەوێشەوە بۆ سەروو نێردراوە، داوایان کردووە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم بابەتە بکرێت.</td></tr>
</table>




| | | |
|---|---|---|
| **DH.MKT.** | 01954.00033 | **2 زیلقەعدە 1309** |

٢ زیلقەعدە ١٣٠٩
١٦ مایس ١٣٠٨
بۆ جەنابی والای سەر عەسکەر
لەبەر گرنگی شوێنی قەزای بازیان لە بارەی نیشتەجێ کردنی چەتەکانی هەمەوەند دەبێ جارێکی تر دڵنیا ببنەوە، پێویستیشە لە مەرکەزی قەزا هێزێکی سەربازی هەمیشەیی جێگیر بکرێت، بەڵام بۆ ئەمەش سەربازی شاهانە پێویستی بە بینای نیشتەجێیە، بە تێروانین لە خاڵی ئاسایش و داهات گونجاو نییە، بۆیە ئەو بلۆکە پیادەیەی کە لە بازیان بوونی هەیە، هەروەها بۆ یەك بلۆك ئێستر لە سەربازی شاهانە دوو قاوش دروست بکرێت، ئەو کەرستەیەی پێویستە زیاد بکرێت، بۆ ئەم مەبەستە ڕەزامەندی دراوە لەسەر خەرج کردنی ٢٠٠٠٠ قوروش، بە گوێرەی هەندێك وتە لە ویلایەتی موسڵ تەلەگرافنامە هاتووە و پێشکەش کراوە، پێویستە جێبەجێ بکرێت و رابگەیەندرێت.


T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
1959 | 60

DH.MKT.01959.00060.001

| | | |
|---|---|---|
| 14 زیلقەوعدە 1309 | 01959.00060 | DH.MKT. |

١٤ زیلقەعدە ١٣٠٩
٢٨ مایس ١٣٠٨
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی و نەزارەتی دارایی پایەبەرز
هەمەوەندەکان لە شەش هۆز پێکهاتوون، لە هەر هۆزێك یەکێکیان بە شێوەیەکی هەمیشەیی لە کەرکووك بمێننەوە، لەگەڵ قەبوڵ کردنی تکاوپارانەوەیان لە قەزای بازیان نیشتەجێ بکرێن، لەوانەش لەو شەش کەسەی کە دێنە کەرکووك بۆ هەر یەکە ١٠٠٠ قوروش مانگانە مووچەیان بۆ ببرێتەوە، ئەوانەی لە گوندیش نیشتەجێ دەکرێن بە تەخمین خۆراك و زەخیرەیان بۆ دابین بکرێت، بە بڕیاری ئەنجوومەنی تایبەتی بریکارەکان لەسەر فەرمانی پاشای جەنابی پاشا لە ١٤ تەممووز ١٣٠٧ ژمارە ٧٠١ نووسراوی سەدارەتپەناهی نەزارەتی دارایی لەگەڵ ویلایەتی موسڵ گفتوگۆ لە نێوانیان کراوە، گشت کاغەزەکانی حەواڵەی نەزارەتی ژمێریاری کراوە، ئەمجارە ئەو نووسراوەی کە دراوە تێدا هاتووە بۆ ئەم شەش کەسە لە مێژووی نووسراوی ناوهاتوو تا کۆتایی ساڵی ١٣٠٧ کۆتایی شوبات ئەو برە پارەیەی کە دەدرێت، لە موازەنەی ئەم ساڵەوە دابین دەکرێت، هەروەها لە مارتی ئەم ساڵەوە تا کۆتایی شوبات ٧٢٠٠٠ قوروش لە ساڵی باسکراودا ڕێك دەخرێت، لە موازەنەی ساڵی ١٣٠٩ دەنووسرێتەوە و هەشت یەکی زەخیرەکەش لە ٢٧٠٠٠ قوروش لە موازەنەی ساڵی ١٣٠٧ ڕێك دەخرێت، بەم شێوەیە بە هاوکاری وەکالەتپەناهی بفەرمووێت چۆنیەتی جێبەجێ کردنی لە نەزارەتی دارایی ئاماژەی پێکراوە و راگەیەندراوە.

دارایی
بە پشت بەستن بە نووسراو ئەو زەخیرەیەی کە دەدرێت ٢٧٠٠٠ قوروش لە ساڵی ١٣٠٧ دەنووسرێتەوە و هەژمار دەکرێت، لە پارەوپولی ویلایەتی موسڵ ڕێك دەخرێت، بۆ ئەمەش حەواڵە نامە ڕێکخراوە و نووسراوەتەوە، بۆ سەروو نێردراوە، ئەمەش لە نەزارەتی ژمێریاری ئاماژەی پێکراوە، بۆ جێبەجێ کردن.




| DH.MKT. | 01965.00041 | 27 زیلقەعدە 1309 |
|---|---|---|

٢٧ زیلقەعدە ١٣٠٩
١٠ حوزەیران ١٣٠٨
بۆ ویلایەتی موسڵ

هەمەوەنـدەکان لـە شـەش هـۆز پێـك هاتـوون، لـە هەر هۆزێـك یەکێکیان بە شـێوەیەکی هەمیشـەیی لـە کەرکوك دەمێننـەوە، لەگـەڵ قەبـوڵ کردنـی ملکـەچ بوونیـان، نیشـتەجێ کردنیـان لە قـەزای بازیـان و ئەوانەی کـە هاتوونەتە کەرکـوك بـۆ شـەش کەسـەکە بـۆ هـەر یەکەیـان ١٠٠٠ قـوروش مووچەیـان بـۆ ببڕێتـەوە، هەروەهـا بـۆ ئەوانـەی لە گونـدەکان نیشـتەجێ کـراون، زەخیرەیـان پـێ بدرێـت، بـە بوونـی فەرمانـی پاشـای جەنابی پاشا ئـەوەی بـاس کراوە بـۆ ئـەم شـەش کەسـە لـە ١٣٠٧ تەممـوز ١٤ تـا کۆتایـی شـوباتی هەمـان سـاڵی ناوهاتـوو، ئـەو بـڕە پارەیـەی پێیـان دەدرێـت، لـە موازەنـەی سـاڵی ناوهاتـوو ڕێـك دەخرێـت، بـۆ سـاڵانی تریـش جێبەجـێ دەکرێـت، هەروەهـا لـەم سـاڵە لـە مارتـەوە تـا کۆتایـی شـوبات ٧٢٠٠٠ قـوروش ڕێکخـراوە و دەدرێـت، بـۆ موازەنـەی سـاڵی ١٣٠٩ و زەخیـرە لـە ٢٧٠٠٠ قـوروش لـە موازەنـەی سـاڵی ١٣٠٧ ڕێکخـراوە، بـۆ جێبەجـێ کردنـی نەزارەتـی دارایـی ئـاگادار کراوەتەوە، هیممـەت بکرێـت بـۆ جێبەجـێ کردنی.




| DH.MKT. | 01970.00008 | 18 زیلحیجە 1309 |
|---|---|---|

۱۸ زیلحیجە ۱۳۰۹
۲۷ حوزەیران ۱۳۰۸
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی

لە ویلایەتی موسڵ سانجەقی سلێمانیە، لە دانیشتووانی قەزای بازیان دوورخراوەتەوە بۆ بەنغازی، جگە لەمە لە پۆلیسی ئۆن باشیە، بەناوی ئەحمەد لە بەنغازی مردووە، خانەوادەکەی لە هەشت کەس پێك هاتوون، بە هاوەڵی یوزباشی مەحمود ئاغا لە سەرۆکەکانی هۆزی هەمەوەند چوونەتە ئیشکۆدرە ، لەبەر ئەوەی لە بەرێوەبردنی بژێوی ژیانیان زەحمەتی دەکێشن، بۆیە داوایان کردووە بە فەرمانی پاشا رێگە دراوە بگەرێنەوە قەزای خۆیان، بۆیە داوای مۆڵەت دەکەن تا بگەرێنەوە، چۆنیەتەکەشی پرسیار لە یوزباشی مەحمود ئاغا کراوە، دەرکەوتووە ئەوانە لە هۆزی ناوبراو نین، هەرچی رۆیشتنی هەردوولا بۆ ئیشکۆدرە ئەوە خانەوادەی ئەحمەدی مردوو لەگەڵ ئۆن باشی ئەحمەدەکەی تر تێکەڵ بووە کە لە سلکی پۆلیسی ئیشکۆدرە کار دەکات، لەبەر ئەوەی ناوەکەیان وەکو یەکە و بە یەکتر شوبهێندراوە، بۆیە گوازراونەتەوە ئیشکۆدرە، هەروەها خانەوادەی ناوهاتوو بژێوی ژیانیان زۆر خراپە و پەرێشانن، بۆ جێبەجێ کردنی ئەو کارە نووسراوی هاوپێچ لە ویلایەتی ئیشکۆدرە هاتووە، راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، بە تێروانین لە ئاماژەپێکردنەکە، ئەگەرچی لەسەر داواکردنی خۆیان رۆیشتنیان بۆ قەزای ناوهاتوو هیچ کێشەیەکی نییە، بەڵام بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارە پێویستی بە راوبۆچوونی جەنابی سەدارەتپەناهیە.



DH.MKT.01976.00034.001

<table>
<tr><td>DH. MKT.</td><td>01976.00034</td><td>27 زیلحیجە 1309</td></tr>
<tr><td colspan="3">٢٧ زیلحیجە ١٣٠٩<br>٩ تەمموز ١٣٠٨<br>بۆ نەزارەتی دادوەری و سندوقی خانەنشینی جەلیلە<br>یاریدەدەری لێکۆڵەری پێشووی بازیان و لە خانەدانی کەرکووك عومەر زادە حاجی سالم ئەفەندی داوای کردووە تاقیکردنەوەی بەڕێوەبەری ناحیەی پێ بکرێت و قەبوڵ کراوە، دەستپێك هۆکاری جیابوونەوەی لە یاریدەدەری ناوهاتوو، لە نەزارەتی جەلیلە پرسیار کراوە و لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران بە نووسراو باسکراوە، بە لێکۆڵینەوە چۆنیەتی کارەکە ئاماژەی پێکراوە، سەروو فەرموویەتی هیممەت بکرێت بۆ جێبەجێ کردنی.<br><br>بۆ سندوقی خانەنشینی<br>ناوبراو لە ئەسکەلەی تاق تاق و نووسینی ئەنباریش کاری کردووە، لەم کارە ئەوانەی خزمەتیان کردووە، مووچەکانیان لە ٥٪ی دەستی بەسەرداگیراوە و دەستی بەسەردا دەگیرێت.</td></tr>
</table>

| 17 شەوال 1310 | 00022.00008 | I.TAL. |
| --- | --- | --- |

- ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ٨
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
بۆ جەنابی دەوڵەت
لە ناو سانجەقی سلێمانیە لە قائیمقامیەتی قەزای بازیان ئیبراهیم بەگ، هەر خۆی لە خانەدانەکانی سانجەقی قۆزانە، هەروەها لە قەزای ناوهاتوو کاری زۆر باشی کردووە، ڕێگەی نەداوە کاری چەتەیی هەمەوەندەکان و چەتەکان پەرەبسەنێت و ڕێگری لێیان کردووە، ئامادەکاری کردووە و هۆزەکانی نیشتەجێ کردووە و بە کشتوکاڵەوە خەریکی کردوون، جگە لەمە ئازایەتی و کارەکانی لە قەزای ناوهاتوو لە ڕووی کارگێریەوە بەباشی بەڕێوەی بردووە، هەوڵ و کۆششەکانی بە دڵسۆزیەوە شایەدە کە بۆتە هۆی زیادکردنی داهات، بۆئەم جۆرە کەسانە نیشانی سەروو پێویستە، بەهۆی خزمەتەکانی ناوبراو پاداشت بکرێت و پلەکەی بۆ پلەی سێیەم بەرز بکرێتەوە، ئەمەش هاوکاری نەزارەتپەناهی جەلیلەی دەوێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٢ ڕەمەزان ١٣١٠ و لە ١٨ مارت ١٣٠٩.
نوری عوسمان کوڕی محەمەد والی موسڵ

- بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ٣٧١
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
ڕاگەیەندراوی بەندەمانە
قائیمقامی قەزای بازیان ئیبراهیم بەگ بە بۆنەی هەوڵ و کارەکانی لە نیشتەجێ کردنی هۆزەکان و زیادکردنی داهات و پاراستنی ئاسایشی ناوەخۆ و لە ڕێگای ڕاپۆرتەوە خزمەتە باشەکانی دیار کەوتووە، بۆ پلەی سێیەم ڕێزی لێ گیراوە، بۆ ئەمەش لە ویلایەتی موسڵ نووسراو لە مێژووی ١٨ مارت ١٣٠٩ ژمارە ٨ لە تۆماری ناسنامە نووسراوەتەوە، بەیەکەوە پێشکەش کراوە، هەروەها تێروانین لە ڕاگەیاندنی ئەو خزمەتانەی ناوبراو کردوویەتی ئەگەر گونجاو بێت پلەکەی بۆ پلەی چوارەم بەرز بکرێتەوە، ئەوا جێبەجێ بکرێت، بۆ ئەمەش هاوکاری سەدارەتپەناهی پێویستە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
١٧ شەوال ١٣١٠ و ٢٢ نیسان ١٣٠٩
نازری کاروباری ناوەخۆ




| DH.MKT. | 00029.00036 | 17 شەوال 1310 |
|---|---|---|

١٧ شەوال ١٣١٠
٢٢ نیسان ١٣٠٩
جەنابی‌سەدارەتپەناهی
بـۆ پاراسـتنی ناوچەکـە قائیمقامـی قـەزای بازیـان ئیبراهیـم بـەگ هەوڵـی داوە و کاری کـردووە بۆ نیشـتەجێ کردنی هـۆزەکان لەگـەڵ زیادکردنـی داهاتـەکان و سـەقامگیر کردنـی ئاسایش، بەهـۆی ئەو ناوبانگیـەی کە هەیەتـی لەبەر کارە باشـەکانی، لـە بـارەی بەرزکردنـەوەی پلەکـەی بـۆ پلـە سـێ لـە مێـژووی ١٨ مـارت ١٣٠٩ ژمـارە ٨ نـووسراو لـە ویلایەتـی موسـڵ هاتـووە، ئـەم نـووسراوە لەگـەڵ تۆمـاری کەسـێتی بەیەکـەوە پێشـکەش کـراوە، هەروەهـا بـە تێروانیـن لـە راگەیاندنـی خزمەتەکانـی ناوبـراو ئەگـەر گونجـاو بێـت پلـەی ناوبـراو بـۆ پلـە چـوار بـەرز بکرێتـەوە، جێبەجـێ کردنـی دەگەڕێتـەوە بـۆ جەنابـی سـەدارەتپەناهی.




| | | |
|---|---|---|
| 19 زیلقەعدە 1310 | 00062.00013 | DH.MKT. |

نەزارەتی ناوەخۆ

پێشەکی ئەو هەمەوەندانە کە لە بەنغازی مابوونەوە زستانی رابردوو بە هەڵاتووی گەراونەتەوە بازیان و بوێریان کردووە دەست بە چەتەگەری بکەنەوە، ئەو ئاماژانەش لە موتەسەرفیەتی کەرکووکەوە باسکراوە، ناوبراو بە گەران و سوران دەستگیرکراونەتەوە، بۆ ئەوەی رێگە بە شەڕ کردن نەدرێتەوە، بۆ موتەسەرفیەتی خۆچێی نووسراوەتەوە، چ لە بەنغازی بێت یاخود لە شوێنێکی تر بێت ئەو شوێنانەی لەلایەن چەتەکانەوە وێران کراوە، ئەو چەتانەی لەو شوێنانەی کە دەدۆزرێتەوە، بخرێنە ژێر نەزارەت و چاودێریەوە، ئەگەر بەم شێوەیەش رێگە لە هەڵاتنیان نەگیرێت، دیسان کۆمەڵ دروست دەکەن و دەست بە فراوان بوونی چەتەگەریەتی دەکەنەوە، ئەوانە هەر یەکە بخرێنە ژێر تۆماری دەستەیەکەوە، راگەیەندراوە لەسەر جێبەجێ کردنی فەرمانەکە.

لە ٢٣ مایس ١٣٠٩
عوسمان والی موسڵ




| DH.MKT. | 00073.00017 | 8 زیلحیجه 1310 |
| --- | --- | --- |
| ٨ زیلحیجه ١٣١٠<br>١٠ حوزەیران ١٣٠٩<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>لە کاتی ئەرکەکەی قائیمقامی قەزای بازیان ئیبراهیم ئەفەندی داوا کراوە پلەکەی بۆ پلە چوار بەرز بکرێتەوە، ئەمەش بە مۆڵەت وەرگرتن، بە فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی فەرموویەتی. | | |




| | | |
|---|---|---|
| 26 زیلحیجە 1310 | 0089.00045 | DH.MKT. |

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران
ژمارە ٢٨٤
لە ناو ویلایەتی موسڵ لەلایەن قائیمقامی قەزای بازیان ئیبراهیم بەگ تەلەگرافنامە حەواڵە کراوە، لەبەر ئەوەی لەگەڵ کەشوهەوای ناوچەکە ئاوێتە نابێت، ئەگەرچی داوای کردووە بۆ یەکێك لە قەزاکانی ویلایەتی حەلەب بنێردرێت، بەڵام ئێستا بە هەمان چینی ناوبراو شوێنێکی گونجاو نییە بۆی بنێردرێت، بێگومان دەکرێت لە ناو ویلایەت لە چینی خۆی قەزایەك بدۆزرێتەوە و ئەرکەکەیان بگۆردرێتەوە، ئەمەش بە بریارنامە بە فەرمان و ئاماژە بۆ ویلایەتی موسڵ نووسراو کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٦ زیلحیجە ١٣١٠ و لە ٢٨ حوزەیران ١٣٠٩.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
166 | 12435 | 2

BEO.000166.012435.002

| BEO. | 000166.012435 | 12 شەعبان 1310 |
| --- | --- | --- |

نەزارەتی کاروباری دارایی
ئەنجوومەنی دارایی
ژمارە ١٤٧٤
راگەیاندنیبەندەیە

لە ویلایەتی موسڵی بەهیە لە مێژووی ١ شوبات ١٣٠٨ تەلەگرافنامە وەرگیراوە، بە پشت بەستن بە فەرمانی جەنابی فەریق عومەر وەهبی، لە ناو سانجەقی سلێمانیە قەزای بازیان بۆ کۆکردنەوەی داهاتی دە یەك (عشر) سەربازانی مەفرەزەی نیزامیەی سپاردووە، بۆ ئەمەش کرێی بارگیرەکان دراوە، لە خۆچێی ئاماژەی پێکراوە ١١٤٠ قوروش تەنیا بۆ خەرجی دە یەك ناوبراو بە سەنەدی خۆی لە سندوقی دارایی مەرکەز ٤٠٠٠ قوروشی وەرگرتووە، لەلایەن عاجیزانەوە بە خۆی ووتراوە، هەرچی زووە هەژمارەکەی نەدراوە، ئەو قەزایانەی کە سەر بە ویلایەتە بە ئەمانەت بەرێوەدەبردرێت و بۆ ئەو شوێنانەی کە لەلایەن ئەفسەر و تاکی سەربازی کراوەتە سیستەمی دە یەك، بۆ دە یەکەکانی ئەم قەزایانە ئاقچەی تر وەردەگیرێت، بۆ ئەم مامەڵانەش بە گوێرەی پێویست پرس کراوە، لەم بارەیەوە لە ویلایەتی ناوهاتوو لە یەکەم و دوا ئاماژەکردنەکان روون کردنەوە کراوە، لە بەرامبەر سەنەداتی پەسەند کراودا ئەو پارەی لە سندوقی دارایی وەرگیراوە، لێکۆڵینەوە و مامەڵە جێبەجێ کراوە، فەرمانیش دراوە ئەم لێکۆڵینەوەیە بنێردرێتە دەستەی لێکۆڵینەوە لە ویلایەتی موسڵ، بە گوێرەی نووسراوی ٢٣ و ٣١ کانوونی دووەم ١٣٠٨ راگەیەندراوە و ئاماژەی پێکراوە، ئەوەی لە تەلەگرافنامەکە لە خەرجی دە یەك باسکراوە، ئەوووردبینیەی پێویستە بکرێت لە دەستەی ناوهاتوو فەرمان دراوە و نووسراویش بۆ وەکالەتپەناهی کراوە و راگەیەندراوە، بە حەواڵە لە ئەنجوومەنی دارایی گفتوگۆی لەسەر کراوە، بۆ جێبەجێ کردنیشی داوای هاوکاری کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٢ شەعبان ١٣١٠ و ١٧ شوبات ١٣٠٨.

نازری دارایی


OSMANLI ARŞİVİ
ML.EEM
169 51

خزینۀ خاصۀ شاهانه
املاك همايون ادارهسى

ML.EEM.00169.00051.001

| ML.EEM. | 00169.00051 | 17 ڕەمەزان 1310 |
| --- | --- | --- |

خەزینەی تایبەتی شاهانە
فەرمانگەی ئەملاکی هومایۆن
ژمارە ٣٦٩
لە ناو ویلایەتی موسڵ سانجەقی سلێمانیە قەزای بازیان گوندی ئاغچەلەر لە مێژووی ١٦ تشرینی یەکەم ١٣٠٥ بە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا ئەوەی ماوەتەوە لەو مولکەی کە کردراوە، لە ئەملاکی هومایۆن یەك خانە زیادی کردووە، لە بەڕێوەبەرایەتی دەفتەرخاقانی بەغداد بە گوێرەی یاسا ڕێکخراوە و نێردراوە، پارچەیەك سەنەد لە خەزینە مامەڵەی پێویستی بۆ جێبەجێ کراوە بە هاوپێچ ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لە نووسراوی والای نەزارەتپەناهی لە مێژووی ٩ مارت ١٣٠٩ و لە ٣ ڕەمەزان ١٣١٠ ژمارە ١٩، سەنەدی ناوهاتوو کە لەلای خودی ملوکانەی هومایۆنە دەستی بەسەرداگیراوە، لە باش کیتابەتی جەلیلە نووسراو لە ٥ ڕەمەزان ١٣١٠ و ١١ مارت ١٣٠٩ لە پەراوێزەکەی ڕاگەیەندراوە و نووسراوەتەوە، بۆ جێبەجێ کردنی ئەم مامەڵەیە بۆ ئەم کارە بۆ قەڵەمی سەنەدات حەواڵە بکرێت، نووسراوەتەوە، لە ٢٣ مارت ١٣٠٩.



DH.MKT.01983.00098.001

| 13 موحەررەم 1310 | 01983.00098 | DH.MKT. |
| --- | --- | --- |

١٣ موحەررەم ١٣١٠
٢٥ تەمموز ١٣٠٨
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
بەهـۆی گرنگـی شـوێنی سـتراتیژی قـەزای بازیـان بـە نیشـتەجێ کردنـی چەتەکانـی هەمەوەنـد زیاتـر لـە جـاران دووپاتکراوەتـەوە کـە پێویسـتە هێزێکـی سـەربازی هەمیشـەیی لـە مەرکـەزی قـەزا نیشـتەجێ بکرێـت، بـەڵام نووسراوەتـەوە بـۆ سـەربازی شاهانە بینایـە نییـە و بـۆ ئـەوەی ئاسـایش و پاراسـتنی سـەربازەکان دابیـن بکرێـت لـە بازیـان یـەک بلـۆک پیـادە و یـەک بلـۆک سـوارەی ئێسـتر لـە سـەربازی شـاهانە لەگـەڵ دوو .... و یـەک تـۆپ دابیـن بکرێـت، بـۆ ئەمـەش پێویسـتی بـە کەرسـتەی زیاتـرە، بۆیە دەبـێ مۆڵـەت بدرێـت لـە خەرجکردنـی ٢٠٠٠٠ قـوروش، بـۆ ئەمـەش تەلەگرافنامـە لـە مێـژووی ١٢ مایـس ١٣٠٨ لـە ویلایـەت هاتـووە، بـە گفتوگـۆ لەگـەڵ لایەنـی واڵای سـەر عەسـکەر ئـەو وەڵامـەی بـە نـووسراو هاتـووە، لـە قـەزای ناوبـراو هۆزێکـی زۆر کۆبۆتـەوە و هەمەوەندەکانیـش لـەوێ نیشـتەجێ بوونـە، مەرکـەزی قـەزا کـە چەمچەماڵـە ئـەو بینایـەی لەسـەر پردەکـە بـووە رووخێـنراوە، دووبـارە یـەک بلـۆک پیـادە و یـەک بلـۆک سـوارەی ئێسـتر داوا کـراوە، لەگـەڵ دروسـت کردنـی قشـلەیەک برێکـی زۆر سـەرباز نیشـتەجێ دەکرێـت، بـەم شـێوەیەش ئاسـایش بەرقـەرار دەبێـت، بـە تێروانیـن لـە دەرخسـتن و رسـومات ٤٩٩١٣ قـوروش کارەکـە تـەواو دەبێـت، لە موشـیرەتی لەشـکری شەشـەمی هومایۆنی جەلیلە ئامـاژەی پێکـراوە، بۆ جێبەجێ کردنـی کارەکـەش بـە مۆڵەتـی فەرمانـی پاشـای جەنابی پاشـا بفەرمووێت بـە تەلەگراف موشـیرەتی ناوهاتوو ئـاگادار دەکرێتـەوە و بابەتەکـەی پێرادەگەیەندرێـت، بـە گوێـرەی ئەمـەش هیممـەت دەکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی کارەکـە.




| | | |
|---|---|---|
| 25 موحەررەم 1310 | 01989.00026 | DH.MKT. |

٢٥ موحەررەم ١٣١٠
٦ ئۆغستۆس ١٣٠٨
جەنابی سەدارەتپەناهی
ئەو شوێنە دیاریکراوانەی کە هەمەوەندەکان بۆی ڕۆیشتوون، بۆ خەرجی نیشتەجێ کردنیان و خەرجی تر، ئەو زەوییانەی کە لەلایەنی بازیانن و ئەو مولکانەی بۆ فرۆشتنە داوای دەکەن بە بڕیاری ئەنجوومەنی تایبەتی بریکارەکان و فەرمانی پاشای جەنابی پاشا پێشەکی بە نەزارەتی عاجیزانەی ویلایەتی موسڵ ڕاگەیەندراوە، ئەو زەوییە باسکراوانە لە شوێن خۆی خراوەتە موزایەدەوە، ئەگەرچی لەگەڵ شوێنگرەوە داواکاریەکانیان دیاری کراوە و خراوەتە سەریان، بەڵام بەم دواییە هەمەوەندەکان لە شوێنە دوورخراوەکانیان هەڵاتوون گەڕاونەتەوە دەورووبەری شارەزوور و سلێمانیە، لەسەر داوای ئەوان لە لای بازیان نیشتەجێ کراون، لە سەرۆکەکانیان چەند کەسێکیان مووچەیان بۆ بڕاوەتەوە، چەند کەسێکیشی لە سلکی پۆلیسی پاراستن دامەزراون، ئەو زەوی و مولکانەی بۆ فرۆشتنە چاوپێداخشاندنەوەی بۆ نەکراوە، ئەمجارە لە ویلایەتی موسڵ نووسراو هاتووە، پرس کراوە، ئەوانە لە گەڕانەوەیان بۆ ئێرە، دووبارە لەوێ نیشتەجێ دەکرێن، لەو کاتە پێویستیان بەم زەوی و مولکانە دەبێت، بۆ جێبەجێ کردنیشی فەرمانی سەرووی سەدارەتپەناهی دەنێردرێت.



| DH.MKT. | 00141.00045 | 18 رەبیعی یەکەم 1311 |
|---|---|---|

١٨ رەبیعی یەکەم ١٣١١
١٦ ئەیلوول ١٣٠٩
بۆ ویلایەتی موسڵی جەلیلە
بۆ قائیمقامیەتی قەزای بازیان ئیبراهیم ئەفەندی دامەزراوە، لەگەڵ گەیشتنی بۆ شوێنی ئەرکەکەی و لە مێژووی دەست بەکاربوونی تۆمار کراوە مانگانە ١٧٥٠ قوروش مووچەی بۆ براوەتەوە، لە مێژووی باسکراو لەگەڵ جێبەجێ کردنی کارەکان بە پشت بەستن بە راگەیاندن و بریارنامە مانگانە ئەو مووچەی وەریدەگرێت نیوەی هەروەها هەموو مانگ لە مووچەکەی لە ٥٪ لەگەڵ ١٪ بۆ خانەنشینی دەروات، هەروەها مانگانەی دووەمی ٥٪ بۆ سندوقی قۆمیسیۆنی هاوکاری مولکیە دەنێردرێت، جگە لەمە خەرجی رێگاکەشی ٣١٦٢ قوروش لە پارەوپولی خۆچێی رێك دەخرێت، ئەمەش لە خشتەی خەرجی نووسراوەتەوە، بۆ راگەیاندنی ئەمەش لە ژمێریاری باسکراوە، هیممەت بکرێت بۆ جێبەجێ کردنی.


DH.MKT 147/39 2

DH.MKT.00147.00039.002

| DH.MKT. | 00147.00039 | 23 ڕەبیعی یەکەم 1311 |
| --- | --- | --- |
| سەرپەرشتیاری سەربازی قۆمیسیۆنی سەروو سەرۆکی دووەم جەنابی ئیسماعیل حەقی پاشا، تەلەگرافی بە شیفرە<br>ئەو هەمەوەندانەی لە بەنغازینە بە تەواوەتی هەڵاتوون، ئاوا گوێ بیست بوون کە بە یەك و دووان بۆ بازیان دێن، ئەگەرچی جەنابی پاشا ئاسایشی بەرقەرار کردووە، بەڵام ئەوانە هەر دەرفەتێك بدۆزنەوە ناوەستن ئەمەش بە ئەزموون سەلمێنراوە، لەم بارەیەوە چاوەڕێی فەرمانی دەوڵەت دەکەم، فەرمان.<br>٢٢ ئەیلوول ١٣٠٩<br>عارفی موتەسەرفی کەرکووك | | |



DH.MKT.00189.00084.002

| DH.MKT. | 00189.00084 | 30 رەمەزان 1311 |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی نووسین
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
بۆ جەنابی دەوڵەت
نووسراوی ژمارە ١٧٧ لە مێژووی ١٦ کانوونی یەکەم ١٣٠٩ لە نەزارەتپەناهی فەرمانی بۆ دەرچووە و ئاماژەی پێکراوە، لە کارگێری زەوی و زاری پاشای عەمارە، ئەمینی سندوق مدحەت ئەفەندی لە ساڵی ١٢٩٩ بە دواوە بە موچەی مانگانە ٢٤٦ قوروش لە قەزای بازیان وەکو نووسەری نووسینی نووسراو دەست بەکاربووە، هەروەها لە ساڵی ناوهاتوو لە مانگی مایس لە یەکەم رۆژەوە دەستی بە کارەکەی کردووە، لەم ساڵەوە لە سەرەتایی مانگی شوباتەوە دەستی لە کارکێشاوەتەوە هەروەها ناوبراو لە ماوەی کارەکەیدا هیچ شتێکی نەبووە، ئەمەش بە موتەسەرفیەتی سلێمانیە راگەیەندراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە کۆتایی رەمەزان ١٣١١ و لە ٢٥ مارتی ١٣١٠.
وەکیلی ویلایەتی موسڵ میری لیوا



| 14 رەجەب 1311 | 00198.00019 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٤ رەجەب ١٣١١
١٠ کانوونی دووەم ١٣٠٩
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی پایەبەرز
قائیمقامی قەزای بازیان ئیبراهیم بەگ لە کاتی جێبەجێ کردنی ئەرکەکەی، بە مەبەستی کوشتنی بەڕێوەبەری دارایی پێشووی قەزای ناوبراو سەید مەحمود ئەفەندی بە ڕێگەی کەسێك بە ناوی بەکر بە لێدانی داوە، لەبەر ئەم پروپاگەندەیە قائیمقامی ناوبراو لەگەڵ هاوبەشی تاوانەکەی بەکر لێکۆڵینەوەی یاسایی کراوە و لە ئەنجامەکەیدا بە گوێرەی هەواڵی ئەنجامدەری کارەکە لەگەڵ لێکۆڵینەوەکە لەلایەن دادوەری لێکۆڵەر بە پلەی تاوان هەژمار کراوە، بریار دراوە کاغەزەکان بنێردرێتە دەستەی تاوان (هیئه اتهامیه) هەروەها لەبەر ئەوەی قائیمقامی ناوهاتوو بە هاوبەشی یەکێك ئەو تاوانەی ئەنجام داوە، دادگایی کردنی لە دادگای دادوەری ئەنجام دەدرێت، بەڵام دادگاییەکەی لەسەر فەرمانی پاشای جەنابی پاشا وەستاوە، لە داواکاری گشتی بەغداد راگەیاندن راگەیەندراوە لە بارەی جێبەجێ کردنی کارەکە نووسراو لە مێژووی ٣٠ کانوونی یەکەم ١٣٠٩ ژمارە ٢٠٥ لە نەزارەتی جەلیلە هاوپێچ پێشکەش کراوە، جێبەجێ کردنی بۆ جەنابی سەدارەتپەناهیە.



| کۆتایی شەوال 1311 | 00232.00066 | DH.MKT. |
|---|---|---|

کۆتایی شەوال ١٣١١
٢٤ نیسان ١٣١٠
بۆ ویلایەتی موسڵ
لە سەردەمی قائیمقام ئیبراهیم بەگ لە قەزای بازیان لە قەزای ناوهاتوو بەرێوەبەری دارایی پێشوو سەعید مەحمود ئەفەندی بە مەبەستی کوشتنی برادەری بە ناوی بەکر لێی داوە، بە گوێرەی ئەو لێکۆڵینەوە یاساییەی کە کراوە، لە ئەنجام دەرکەوتووە، قائیمقامی ناوبراو لەسەر ئەو بریارەی لەلایەن دەوڵەتەوە دراوە بۆ دادگایی کردنێکی نیزامیە، بە مۆڵەتی فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی زانیاری دراوەتە نەزارەتی دادوەری، لە مێژووی ١٧ نیسان ١٣١٠ نووسراو لە سەدارەتپەناهی کراوە بۆ جێبەجێ کردن.



| | | |
|---|---|---|
| 4 رەبیعی کۆتایی 1311 | 000294.021992 | BEO. |

٤ رەبیعی کۆتایی ١٣١١
٢ تشرینی یەکەم ١٣٠٩
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لە ناو ویلایەتی موسڵ قائیمقامی قەزای بازیان ئیبراهیم بەگ دوور خراوەتەوە، لە شوێن ئەویش لە چینی سێیەم و لە قائیمقامیەتی سوقولشیوخ محەمەد ئەمین ئەفەندی دادەمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە نووسراوی دەولەت لە ١٨ رەبیعی یەکەم ١٣١١ ژمارە ١٨٣٧ بە مۆڵەتدان لە مێژووی ٢٩ رەجەبی هەمان ساڵ فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی فەرمانی داوە، بۆ جێبەجێ کردنی هیممەت بکرێت.




<table>
<tr><td>BEO.</td><td>000393.029458</td><td>22 شەوال 1311</td></tr>
<tr><td colspan="3">٢٢ شەوال ١٣١١<br>بۆ نەزارەتەکانی ناوەخۆ و دادوەری جەلیلە<br>وێنەکانیان لە سەروو بە نووسراو ڕاگەیەندراوە، هەروەها بە فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارە کاغەز نێردراوە و نەزارەتی دادوەری جەلیلە ئاگادار کراوەتەوە کە هیممەت بکات لە جێبەجێ کردنی، سەبارەت بە نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە هێشتا بۆ جێبەجێ کردنی داوا دەکرێت هیممەت بکرێت.<br><br>لە ناو ویلایەتی موسڵ بابەتەکە پەیوەستە بە دادگایی کردنی قائیمقامی قەزای بازیان ئیبراهیم بەگ.</td></tr>
</table>




| I.DH. | 01308.000028 | 25 ره‌بیعی یه‌که‌م 1311 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
٧٧٠
بۆ جەنابی ئەفەندم
لە نـاو ویلایەتـی موسـڵ قائیمقامـی قـەزای بازیـان بەهـۆی جموجۆڵـە نەگونجاوەکانـی چاکـتر وایە لـەوێ نەمێنێت و دووربخرێتـەوە، لـە ویلایەتـی ناوهاتـوو ئامـاژە نێـردراوە، هەروەهـا خۆشـی وازی لـە ئەرکەکـەی هێنـاوە، بۆیـە بـۆ قائیمقامیەتـی قـەزای ناوهاتـوو محەمـەد ئەمیـن ئەفەنـدی هەڵبژێـردراو لـە چینـی سـێیەم و لـە قائیمقامیەتـی سوقولشـیوخ جیابۆتـەوە، دووبـارە بەکارهێنانـەوەی لـە قائیمقامیەتێکـی تـر بـە بریـاری شـورای دەوڵـەت لـە بـارەی دامەزراندنیـەوە لـە قۆمیسـیۆنی هەڵبژاردنـی فەرمانبـەران بریارنامـە و کاغـەزی وەرگێـردراوی کەسـێتی ڕێکخـراوە و پێشـکەش کـراوە، لەگـەڵ نـوسراوی هاوپێچـی نەزارەتـی ناوەخـۆی جەلیلـە ڕاگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بارەیـەوە بـە هـەر شـێوەیەك بێـت فەرمانـی پاشـای جەنابـی خەلافەتپەناهـی چ بفەرمووێـت جێبەجـێ دەکرێـت، لەگـەڵ ڕاگەیاندنـی نـوسراو ژمـارەی لەسـەر تۆمـار کـراوە ئەفەنـدم.
لە ٢٥ رەبیعی یەکەم ١٣١١ و لە ٢٣ ئەیلوول ١٣٠٩
سەدری ئەعزەم و هاوکاری



| 12 شەوال 1311 | 01312.000026 | I.DH. |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
٢٣٢٨
بۆ جەنابی ئەفەندم
لە ناو ویلایەتی موسڵ قائیمقامی قەزای بازیان ئیبراهیم بەگ لە كاتی جێبەجێ كردنی ئەركەكەیدا بە مەبەستی كوشتنی بەڕێوەبەری دارایی قەزای ناوبراو سەعید مەحمود ئەفەندی، بە برادەری خۆی بە ناوی بەكر بە لێدانی داوە، دوای ئەو لێكۆڵینەوە یاساییانەی ئەنجام دراون، لە ئەنجامدا دەركەوتووە، قائیمقامی ناوبراو لە دادگای نیزامیە بە مەبەستی دادگایی كردنی ویلایەت ئاگادار كراوەتەوە، حەواڵەی نەزارەتی ناوخۆی جەلیلەش كراوە، هەروەها بۆ جێبەجێ كردنی مامەڵەی جیاوازیش نووسراو كراوە لەگەڵ بڕیارنامەی شورای دەوڵەت لە فەرمانگەی ناوخۆ هاوپێچ راگەیەندراوە و پێشكەش كراوە، بە هەر شێوەیەك بێت ئەمر و فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی چ بفەرمووێت، بڕیارەكە جێبەجێ دەكرێت، نووسراو بە ژمارە تۆمار كرا ئەفەندم.

لە ١٢ شەوال ١٣١١ و لە ٦ نیسان ١٣١٠
سەدری ئەعزەم و هاوكاری




<table dir="rtl">
<tr><th>DH.MKT.</th><th>00301.00045</th><th>1 رەمەزان 1312</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەتی پیرۆز<br>قەڵەمی نووسین<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>بۆ جەنابی ئەفەندم<br>ساڵی رابردوو لەگەڵ ٥٠ خانەی کەسوکاری لە ئێران هیجرەتی کرد، هانای بۆ جەنابی خەلافەتپەناهی هێنا و ملکەچ بوونی خۆی راگەیاند، لە هۆزی کەلهور محەمەد بەگ لە قەزای بازیان نیشتەجێ بووە، ئەگەرچی بۆ جێبەجێ کردنی راگەیەندراوە کە لەم جۆرە هیجرەتانە لە داهاتی بەروبووم لە دە یەکی دوو ساڵ لێدەبوردرێن، لە سەرمەڕ رسومات وەردەگیرێت، لە بارەی وەرنەگرتنی هیچ فەرمانێك نییە، بە راگەیاندنی ویلایەتی موسڵ مامەڵەی راپرسی کراوە و لە مێژووی ٢٩ رەبیعی کۆتایی ١٣١٢ ژمارە ٢٧٢٧ نووسراوی دەوڵەت حەواڵەی شورای دەوڵەت کراوە، هەواڵ بە نەزارەتی داراییش دراوە بە گوێرەی ئەوەی دەرکەوتووە ئەوانەی لە رووسیاوە لە تاتار و چەرکەسەکان بۆ مەمالیکی مەحروسەی شاهانە هیجرەتیان کردووە بە ماوەیەکی دیاریکراودا لە مامەڵەی باج و سەرانە و دە یەك دەبووردرێن، تەنیا لە رسوماتی مەروماڵات و تێچووی گشتی نەبێ نابوردرێن، وەرگرتن و راپرسی بە ئاماژەپێکردن و بریارەوە جێبەجێ کراوە، بۆیە بە گوێرەی زانیاریەکان لە بارەی کۆچبەرەکانەوە جگە لە باج و سەرانە و دە یەکدا لە رسوماتی مەروماڵات و تێچووی گومرگ بە گشتی دەبێ بدەن، بۆ ئەم مەبەستەش نووسراو کراوە، بە بریارنامە لە فەرمانگەی ناوەخۆ باسکراوە، لە ویلایەتیش ئاگاداری هاتووە و داوای هیممەت کراوە تا جێبەجێ بکرێت، لە ١ رەمەزان ١٣١٢ و لە ١٤ شوبات ١٣١٠.<br>سەدری ئەعزەم و یاوەری</td></tr>
</table>



<table>
<tr><td>DH.MKT.</td><td>00350.00042</td><td>15 جەمادی کۆتایی 1312</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی ناوەخۆ<br>١٥ جەمادی کۆتایی ١٣١٢<br>٢٧ مایس ١٣١١<br>جەنابیسەدارەتپەناهی<br>لە ناو سانجەقی سلێمانیە لە بارەی قائیمقامی قەزای بازیان ئەمین ئەفەندی هەواڵ هاتووە بە هۆی کاری خراپەوە لە خۆچێی لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە، کاغەزی لێکۆڵینەوەکان نێردراوە، لەگەڵ ئەو کاغەزانەی کە لە ویلایەتی موسڵ هاتووە، بەیەکەوە لەگەڵ نووسراوم لە مێژووی ١٨ شوبات ١٣١١ پێشکەش کرا بوو، ناوبروا دەستی لە کارکێشاوەتەوە و خۆشی لەبەر بارودۆخی خراپی خۆی پاراوەتەوە، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە ئەمجارە لە ویلایەتی ناوهاتوو تەلەگرافنامە لە مێژووی ٤ مایس ١٣١١ پێشکەش کراوە، بەم تێروانینە جێبەجێ بکرێت و فەرمان و کۆتایی هاتنی بەستراوەتەوە بە هاوکاری جەنابی سەدارەتپەناهی.</td></tr>
</table>




| DH.MKT. | 00380.00041 | 5 رەمەزان 1312 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ٤٣٢١
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
راگەیەندراوی بەندەتانە
لە ناو سانجەقی سلێمانیە ئەمین ئەفەندی قائیمقامی قەزای بازیان هەواڵ نێردراوە کە کاری خراپ ئەنجام دەدات، ئەو لێکۆڵینەوانەی ئەنجام دراون، کاغەزەکانی نێردراوە، لە ویلایەتی موسڵ بە مێژووی ٣١ کانوونی دووەم ١٣١٠ نووسراو هاتووە، لەگەڵ کاغەزەکانی باس کراودا بەیەکەوە پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٥ رەمەزان ١٣١٢ و لە ١٨ شوبات ١٣١٠.
نازری کاروباری ناوەخۆ



| DH.MKT. | 00383.00031 | 17 زیلحیجه 1312 |
|---|---|---|

١٧ زیلحیجه ١٣١٢
٢٩ مایس ١٣١١
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیله لەگەڵ ویلایەتی موسڵی جەلیله
ئەگەرچی ساڵێك و نیوە لە قائیمقامیەتی قەزای بازیان لە ئەرکەکەی خزمەتی کردووە، دوای تێپەربوونی حەوت هەشت ساڵ ئەو مووچەی وەریگرتووە، داوای نیوەی دەکات، بۆ جێبەجێ کردنی بە واژووی عەبدولرەحمان بەگ داواکاری دراوە و داوای دەکات، هەروەها لەبەر ئەوەی ناوبراو ئەرکەکەی لە نەزارەتی عاجیزانە پەسەند نەکراوە، ئەو مووچەیەی کە بە تەواوەتی وەریگرتووە، بە دوای نیوەکەی تر دەگەڕێن، نووسراو لە ٣١ کانوونی یەکەم ١٣١٠ لە ویلایەتی موسڵ هاتووە، هەروەها هاوپێچی ناوبراو لە مێژووی دەستبەکاربوونی تۆمارەکەی لە خەزینەی جەلیلەیە، نێردراوەتە نەزارەتی دارایی جەلیلە، هەروەها مێژووی دەستبەکاربوونی ناوبراو بە رێکەوت لە تۆماری کۆنی نەزارەتی جەلیلە لە پەراوێز ئەرکەکەی نیشان دراوە، جێبەجێ کردنی ئەمر و فەرمانە.




BEO.000546.040904.002

| BEO. | 000546.040904 | 8 رەجەب 1312 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەتی پایەبەرز
قەڵەمی نووسین
تەلەگرافنامەی بە شیفرەی ویلایەتی موسڵە

لە ٧ کانوونی یەکەم ١٣١٠ بە فەرمانی وەکالەتپەناهی ئەو سەربازی شاهانانەی کە ڕۆیشتوون هەواڵ هاتووە کە بێ ئەرزاقن، لەبەر ئەوەی سەربازەکانمان جێگای شانازی ئێمەن، پێویستە دەوڵەت پێداویستیەکانیان بۆ دابین بکات، هەر خۆشی ئەوانە لە پارەوپولی کەرکووك پارەیان بۆ ڕێکخراوە، بۆیە هەرچی زووە داهاتیان بۆ دابین بکرێت، لەم بارەیەوە لەسەر ئاگادارکردنەوەیەکی تەواو بە گوێرەی پێویست ئەرزاقیان بۆ دابین کراوە و نێردراوە، ئەمەش لە تەلەگرافنامەی موتەسەرفی کەرکووك لە مێژووی ٢ کانوونی یەکەم ١٣١٠ دەرکەوتووە، ئەمجارەش لە موتەسەرفی ناوهاتوو ئامۆژگاری تایبەتی دەرچووە، هەروەها لە قائیمقامیەتی بازیان لە بارەی جێبەجێ کردنی دادگایی کردنەکە بە بڕیاری ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەت دەستی لەکار کێشاوەتەوە، لە شوێنی ئەو یەکێك بە وەکالەت دامەزراوە و نێردراوە، لە ١٢ کانوونی یەکەم ١٣١٠.

عەزیز والی



| BEO. | 000572.042852 | 18 شەعبان 1312 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەتی پایەبەرز
تەلەگرافنامەی بە شیفرەی ویلایەتی موسڵ هاتووە
لە خەڵکی بازیان بەکر بەگ بە هۆی تاوانەوە دەستگیر کراوە، تەلەگرافنامەی ١١ کانوونی دووەم ١٣١٠ لە دوایین دێردا ئەمر و فەرمان دراوە، وێنەیەکی فەرمانی سەدارەتپەناهیش بۆ موتەسەرفی کەرکووك نێردراوە، لە وەڵام ئەو تەلەگرافنامەیەی کە هاتووە، ناوبراو بەهۆی رووداوەکەوە سەبارەت بە دەستگیر کردنی سەیری چارەسەرەکەی دەکرێت، ئەگەرچی ئاماژەی پێکراوە، تا ئێستا دەست بەسەر نەکراوە، هەروەها لەو شوێنەی کە خۆی شاردۆتەوە دەبێتە هۆی ناکۆکی نێوان هۆزەکان، لە تەلەگرافنامەی ٦ و ٩ کانوونی دووەم ١٣١٠ راگەیەندراوە، جگە لەوە فەرمانی رۆیشتنی تابورێك دەردەچێت، لە ٣١ کانوونی دووەم ١٣١٠.
عەزیز والی



| 3 زیلقەعدە 1312 | 000621.046533 | BEO. |
|---|---|---|

بۆ جەنابی ئەفەندم
لە ناو سانجەقی سلێمانیە قائیمقامی قەزای بازیان ئەمین ئەفەندی، ئەو بریارنامەیەی بۆ فەرمانی هەڵبژاردنی وەکو ئەندامی دادگایی لە دادگای سەرەتایی سلێمانیە ڕێکخراوە، لەسەر سەرپێچیەکانی وەکیلی نائیب و نووسەری نووسراوەکان، ناوبراو لەگەڵ کوڕەکەی بە مۆرەوە کرێیەکەیان داوەتە پۆلیسی پاراستن، هەروەها خەڵکی ناحیەی سەرچنار لە باجی ١٣١٠ هیچ قەرزێکیان نییە، لەگەڵ ئەوەش لە کاتی ڕۆیشتنی بۆ ناحیەی ناوهاتوو ١٩٠٠ قوروشی کۆکردۆتەوە و دەستی کەوتووە، لە بەرامبەر ئەوەشدا بە تایبەتی هەواڵ و زانیاری داوە، لەگەڵ پۆلیسی ڕەدیف سکاڵای لە بەڕێوەبەری دارایی ڕێکخستووە و بە تەلەگرافنامە زانیاری بە مۆری وەرگرتووە، بە سوتاندنی ............ لەگەڵ کەسێك بە ناوی سەعید لە سەربازانی هەڵاتوو برادەری شەریف دەستگیر کراوە، ئەفەندی ناوبراو لە ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەتی موسڵ لە بارەی دادگایی کردنی ئاگاداری دراوەتە ویلایەت و حەواڵەی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە کراوە، بۆ ئەمەش نووسراو کراوە و بریارنامەی شورای دەوڵەتی فەرمانگەی ناوەخۆ ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، بە هەر شێوەیەك بێت فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی چ بفەرموویەت، ووتەی سەروو جێبەجێ دەکرێت، نووسراو ژمارەی لەسەر نووسرا بەرێزم.
لە ٣ زیلقەعدە ١٣١٢ و لە ١٦ نیسان ١٣١١
سەدری ئەعزەم و هاوکارەکەی جەواد



| 3 رەبیعی کۆتایی 1312 | 01119.00020 | ML.EEM. |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ٧٣٤
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
بۆ جەنابی دەوڵەت
لە قەزای بازیان لە گوندی چەمچەماڵ بە ٦٠ قوروش کرێی مانگانە وەکو فەرمانبەر لە قەزا نیشتەجێ ببوو، خانەی سەید حوسێن ئەفەندی مردوو خەریکە دەکرێتە قۆناغی حکوومەت، لە شوێن ئەوە بە ١٥٠٠ قوروش بکردرێت، بۆ ئەم مەبەستە لە ویلایەتی موسڵی جەلیلە نوسراو نێردراوە، حەواڵەی نەزارەتی ژمێریاری بووە، بری پارەی دیاریکراو، لە موازەنەی ساڵی ١٣١٠ لە بەرامبەر رێکخستنی نۆژەنکردنەوەی نووسراوەتەوە و لە ٢٢٣٠ قوروش رێکخراوە و جێبەجێ کراوە، هەروەها خانەی ناوهاتوو بۆ ئەوەی بە مولکی میری تۆمار بکرێت، ئەگەر مولك بێت یاخود وەقف بکرێت ئەوە سەنەدەکەی بۆ نەزارەتی جەلیلە بنێردرێت، هەروەها هاوپێچەکانی بۆ لایەنی ویلایەت نووسراوەتەوە، بۆ نەزارەتی دەفتەرخاقانی جەلیلەش زانیاری نووسراوەتەوە، بە گوێرەی نەزارەتی جەلیلە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٣ رەبیعی کۆتایی ١٣١٢ و لە ٢١ ئەیلوول ١٣١٠.
نازری کاروباری ناوەخۆ



| DH.SAID. | 00071.00146 | 8 جەمادی یەکەم 1314 |
|---|---|---|

لاپەرە ۲۸۹
تۆماری گشتی
سەید محەمەد سەعید ئەفەندی            کوڕی گۆك تەپەلی سەید محەمەد ساڵح ئەفەندیە
لە ساڵی ۱۲۷۵ کۆچی واتە ساڵی ۱۲۷۵ لە قەزای بازیان لە گۆك تەپە لە دایك بووە، لە تۆماری ناسنامەی عوسمانیە وێنەی پەسەند کراوی نووسراوەتەوە
لە ناوچەی باسکراو پێشەکی لە مەکتەبی سبیان زانستی ئایینی خوێندووە، هەروەها دەتوانی بە زمانی فارسی و تورکی و کوردی قسە بکات.
لە ساڵی ۱۳۱۳ مانگی سەفەری ۲۵ واتە ٥ ئۆغستۆس ۱۳۱۱ بە مووچەی ٦٠٠ قوروش لە سانجەقی سلێمانیە لە بەڕێوەبەرایەتی ناحیەی قەرەتاغ دامەزراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی پارەوپولی دەوڵەتی کەوتۆتە ئەستۆ و ئاقچەی خستۆتە سەر ناوی خۆی و لەبەر مامەڵەی نەشیاوەوە بەردەوام بوونی لە کارەکەی بە گونجاو نەزانراوە، ئەمەش دوای ڕاگەیاندنی ویلایەت لە مێژووی ۱۳۱٤ موحەررەمی ۱۰ واتە ۹ حوزەیران ۱۳۱۲ دوورخراوەتەوە.
ناوبراو کاتێك لە بەڕێوەبەرایەتی ناحیەی باسکراو دامەزراوە، وەکالەتی موتەسەرفیەتی سلێمانیە تێبینی لەسەر نووسراوەتەوە، لە کاغەزی وەرگێردراوی زانیاری ناوبراو ڕاستیەکەی دەرکەوتووە، هەروەها لە ویلایەتی موسڵ پشت ڕاست کراوەتەوە کە زاتی خۆی لە لێهاتووەکانە.
ئەوەی باسکراوە لە بەڕێوەبەرایەتی ماوەی کارەکەی و بڕی مووچەکەی و هۆکاری دوورخستنەوەی لە نووسراوی سەرۆکایەتی قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران وەڵامدراوەتەوە و دەرکەوتووە، جگە لەوەش وێنەی پەسەندکراوی تۆماری ناسنامەی عوسمانیەی لەگەڵ زانیاری وەرگێردراو بەیەکەوە هەڵگیراوە، لە ۸ جەمادی یەکەم ۱۳۱٤ و لە ۳ تشرینی یەکەم ۱۳۱۲.




| I.TAL. | 00111.00065 | 26 زیلقەعدە 1314 |
|---|---|---|

بە نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە لە مێژووی ٢١ شەوال ١٣١٤ ژمارە ١٩٣ ڕێزگرتنەکەیان کۆتایی پێ هاتووە، قائیمقامی بازیان ساڵح بەگ لە جەمادی یەکەمی ساڵی ١٣٠٠ بەهۆی ئەو خزمەتەی کە کردوویەتی و دەوڵەت قەبوڵی کردووە، ناوبراو پلە و نیشانی نییە هەروەها لە ویلایەتی موسڵ لە قەڵەمی ئەنجوومەنی کارگێری ڕەچەڵەکی ناوبراو لە کاغەزی وەرگێردراوی محیەددین بەگ نووسراوە و هاتووە لەوە زیاتر تۆمار و زانیاری تری نییە.

لە ٢٩ مارت ١٣١٣

DH.ŞFR.00211.00108.001

DH.ŞFR.00211.00108.001

| 14 سەفەر 1315 | 00211.00108 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لە بەر گرنگی شوێنی قەزای بازیان هەمەوەندەکان و هۆزە جانەوەرەکان بە تەواوەتی لەوێ دەبینرێن، لە قائیمقامیەتی قەزای بازیان کەسێکی لێهاتووی دەوێت، قائیمقام سەباح بەگ لێهاتوو نییە لەگەڵ ئەوەش روو دەداتە هۆزەکان و نازیان هەڵدەگرێت، ئەمەش وایکردووە لە بەرێوەبردنی فەرمانەکانی حکومەت و بەرقەرار بوونی ئاسایش سەرکەوتوو نەبووە، هەروەها بە هیچ شێوەیەك گرنگی بە داهات نەداوە، ئەمەش وایکردووە بۆ هەر کارێك پێویستی کردووە سەرباز بنێردرێت، ناوبراو بەم حاڵەوە مانەوەی لە ئەرکەکەی گونجاو نییە، هەمەوەندەکانیش بارودۆخی ئەو ناوچەیە بە هەند وەردەگرن، بۆیە ئەم ماوەیە چاودێری کردنی ناوچەکە بە هەند وەربگیرێت و قائیمقامی ناوبراو هەر ئێستا لە کارگێری دووربخرێتەوە، لە شوێن ئەو کەسێکی لێهاتوو بە پەلە دابمەزرێت و بنێردرێت، بەڵام لەبارەی گوستنەوەی ئەرکی قائیمقامەکان بۆ راگەیەندراوی پێویست چوار مانگ دەبێت فەرمانی جێبەجێ کردنی نەدراوە، ئەگەر لەم یەك دوو مانگە دوابکەوێت کارگێریەکەی رێك ناخرێت، لە قەزای ناوهاتوو ئەم ماوەیە بۆ رێکخستنی کارگێریەکەی هەرچی زووە جێبەجێ بکرێت، فەرمان.

٣ تەمموز ١٣١٣
زوهدی والی موسڵ

DH.ŞFR.00215.00013.001

DH.ŞFR.00215.00013.001

| 27 رەبیعی کۆتایی 1315 | 00215.00013 | .DH.ŞFR |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
قائیمقامی قەزای بازیان ساڵح بەگ لە ٣٠ تەممووز ١٣١٣ بە تەلەگراف راگەیەندراوە کە پێویستە لە کارەکەی دوور بخرێتەوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ شکست هێنانی لە بەڕێوەبردنی کارگێری، جگە لەوە لەگەڵ هۆزی هەمەوەند کاری کردووە، لەم بارەیەوە سکاڵای زۆر کراوە، لە کاتی لێکۆڵینەوە بۆ ئەوەی وەڵامی هۆزی ناوبراو بدرێتەوە قائیمقامی ناوبراو لەوە زیاتر کارەکەی درێژ نەکرێتەوە، تا رووداوی قەزاکانی مەعمورەی حەمیدیە و کۆی سانجەق دووبارە نەبێتەوە، قائیمقامی ناوبراو هەر ئێستا دوور بخرێتەوە لە شوێن ئەو بە پەلە کەسێکی لێهاتوو دابمەزرێت و بۆ ناردنی داوای هاوکاری کراوە، دووبارە دەکرێتەوە، فەرمان.
١٣ ئەیلوول ١٣١٣
زەهدی والی موسڵ



DH.TMIK.M.00056.00025.005

| DH.TMIK.M. | 00056.00025 | 11 رەبیعی یەکەم 1316 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە لە ویلایەتی بەغداد
تەلەگرافنامەهاتووە
لە ٧ تەمموز ١٣١٤ لەم ویلایەتە بە پۆستەی تاتارەکان ئەو لێکۆڵینەوانەی لەسەر تفەنگی میری مارتینی کراوە، بۆ لایەنی پەیوەندیدار ئاگاداری پێویست نێردراوە، ئەو شوێنانەی لەگەڵ مەرکەزی ویلایەت بەستراوەتەوە، کاری لاسایی کردنەوەی تفەنگی مارتینی دەکەن، هێشتا وەستاکان نەدۆزراونەتەوە بە گشتی لە وەڵامی ئەو ئاماژانەی کە لە شوێنەکان و فەرمانگەکانی ئەفسەر و پۆلیس وەرگیراوە، نیشان دراوە لە قەسەبەی سلێمانیە سەر بە ویلایەتی موسڵ بیست و یەک، لە گوندی قەرانفا دوو، هەروەها لە قەزاکانی مەرگە و شەهربازار و بازیان بۆ هەر یەکە چوار و هۆزی داودە سێ و لە قەزای سەلاحییە دوو بە کۆکراوەی ٤٦ یاخود ...... کەسەوە کاری ئەو تفەنگانە دەکرێت و دەفرۆشرێت، بە لێکۆڵینەوەی تەواو راگەیەندراوە، فەرمان.
١٨ تەمموز ١٣١٤




Y.PRK.ASK 147/14

Y.PRK.ASK.00147.00014.001

| Y.PRK.ASK. | 00147.00014 | 26 شەعبان 1316 |
| --- | --- | --- |

پایەی سەر عەسکەریەت
قەڵەمی نووسین
تایبەتی
تەلەگرافنامـە لـە موشـیرەتی جلیلـەی لەشـکری شەشـەمی هومایۆن هاتـووە، ئـەو تابورەی لـە چەمچەماڵـە ئەرزاقی سـەربازی و کەلوپەلـی دانیشـتووان بگەیەننـە دەسـتیان، بـۆ سـلێمانی ڕۆیشـتووە ئـەو مەفرەزەیـەی لەگـەڵ ئـەو کاروانـە ڕۆیشـتووە لـە دووری دوو کاتژمێـر لـە کەرکـووك هـۆزی شـوان زیاتـر لـە ٣٠٠ پیـادە و سـوارە لـە چەتەیـەك پێـك هاتبـوون هێرشـیان کردۆتـە سـەریان دوای بـەردەوام بوونـی پێنـج کاتژمێر شـەر لەگەڵ ئـەو مەفرەزە سـەربازیە بەشـێك لـەم ئەرزاقـە سـەربازی و بەشـێك لـە کاروانەکـە لەنـاو چـوون، ئـەو بەشـەی لـە کاروانەکـە ماوەتـەوە لەگەڵ مەفرەزەکـە بـۆ گونـدی چیمـەن ڕۆیشـتوون، هەروەهـا لـە سـەربازی شـاهانە یـەك سـەرباز شـەهید بـووە و دوو کەسـیش بریـندار بـوون و یـەك چاوشـیش وونـە، لەوانـی تریـش ١٠ کـەس بریـنـدارە، لـە بەرامبـەر ئـەوەش لـە کەرکـووك ١٠٥ و لـە چەمچەمـاڵ مەفرەزەیەکـی ٦٠ پیـادە دیسـان لـە چەمچەمـاڵ ٤٥ پۆلیـس نێـردراون، لـە ئەنجـام ڕادەگەیەنـدرێـت، لـە قوماندانیەتـی فرقـەی ١٢ بـە تەلەگرافنامـە ئامـاژەی پێکـراوە، شـوانەکان لـە مەملەکەتـی خۆیان شـەڕ دەکـەن، هەروەهـا هـۆزی شـوان هۆزێکـی گـەورەن تـا دوا ئاماژە مەفـرەزە نەچۆتـە ناو شـوانەکان، لـە ئەنجام پێویسـتە زوو زانیاریـەکان رابگەیەندرێـن، لە وەڵامـدا قوماندانیەتی ناوبـراو ئـاگادار کراوەتەوە، نـووسراو نوسراوەتەوە و زانیـاری دراوەتـە بابـی عالـی و زانیاریـەکان دەسـت کەوتـووە، چۆنیەتـی جێبەجـێ کردنـی کارەکـەش پەلـەی لـێ بکرێـت، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
٢٦ شەعبان ١٣١٦ و لە ٢٨ کانوونی یەکەم ١٣١٤
ڕزا سەر عەسکەر



| | | |
|---|---|---|
| 14 رەبیعی یەکەم 1316 | 00966.00072 | ŞD. |

نەزارەتی سندوقی خانەنشینی مولکیە و دوورخراوان
قەڵەمی نووسین
ژمارە ٥٨٠٣
قائیمقامی بازیان محەمەد ئەمین ئەفەندی مردووە، لەلایەن خێزانەکەی عائیشە خانم و کچەکەی شەفیقە خانم و کوڕەکەی نەفعی ئەفەندی داوایان کردووە مووچەیان بۆ ببڕێتەوە، نووسراوی ویلایەتی موسڵ لەگەڵ داواکاریەکە خشتەی ماوەی خزمەت و کاغەزی پەیوەست بەم بابەتە لە ژمێریاری ڕێکخراوە و پەراوێزی بۆ نووسراوەتەوە، لە دەستەی گشتی ووردبینی بۆ کراوە.
ناوبراو مێژووی ئەو خزمەتانەی کە وەریگرتووە لەگەڵ بری ئەو مووچانەی کە وەریگرتووە دوای مردنی لە مێژووی ٢٥ کانوونی دووەم ١٣١٣ و بە بڕیارنامەی فەرمانبەرانی مولکیە ماددەی ٣٥ و ٣٦ و ٣٩ دوای کەم کردن و زیادکردن ئەوەی شایەنینە ١٨٠ قوروشە، بە یەکسانی لە نێوانیان دابەش دەکرێت، کە هەر یەکەیان ٦٠ قوروشیان بەردەکەوێت، مووچەی باسکراو بە پشت بەستن بە ماددەی ٣٥ مامەڵەکەی جێبەجێ دەکرێت، نووسراو لە سندوق کراوە تا دابین بکرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٤ رەبیعی یەکەم ١٣١٦ و ٢١ تەمموز ١٣١٤.



ML.EEM.01198.00011.001



ML.EEM.01198.00011.015

<table dir="rtl">
<tr><th>ML.EEM.</th><th>01198.00011</th><th>29 ڕەبیعی یەکەم 1316</th></tr>
<tr><td colspan="3">- بەغداد<br>باش مودیریەتی تەلەگراف و پۆستە<br>ژمارە ١٩٨<br>بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی<br>کاغەزی تەلەگرافنامەی خاقانی چەمچەماڵ هاوپێچ پێشکەش کراوە<br>ڕاگەیەندراوی بەندەیە<br>بە ناوی نەزارەتی جەلیلە تەلەگرافخانەی چەمچەماڵ کردراوە، سەنەدی خاقانیەکەی بە دەستکەوتن لە ژمێریاری هەڵدەگیرێت، ئەم داواکاریە هاوپێچ هەر کە پێشکەشی پێشەوای دەوڵەت کرا، جێبەجێ بکرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٩ ڕەبیعی یەکەم ١٣١٦ و لە ٣ ئۆغستۆس ١٣١٤.<br><br>- ٧ حوزەیران ١٣٣٢<br>نەزارەتی دارایی<br>نووسراو<br>قەزایەکانی بازیان و مەعمورەی سەر بە سانجەقی سلێمانیە، ئەو شوێنانەی کە بوونەتە تەلەگرافخانە لەلایەن جەمیل ئەفەندی و مەحمود نەشئەت ئەفەندی کڕین و فرۆشتنی پێکراوە، لەگەڵ شوێنی تر کە پەیوەستە بە ئەوانەوە و ئەم دوو خانەیە بە ناوی حکوومەتی عوسمانیەوە ڕێکخراوە و دەفتەر خاقانیەکەی لە مێژووی ٨ نیسانی ١٣٢٧ ژمارە ٨٢٢ لەگەڵ نووسراو نێردراوە، ئەو دوو پارچە سەنەدی خاقانی کە پێی لکاوە لە مێژووی ٢٨ نیسان ١٣٢٨ بە فەرمانی پاشا لە خەزینەی دارایی ڕێکخراوە، لەم کارە ئەمانەتی ناوهاتوو فەرمانی بۆ دەرچووە و حەواڵە دەکرێت.</td></tr>
</table>



| BEO. | 001210.090714 | 12 جەمادی یەکەم 1316 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین ژمارە ٢٧١٨
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
راگەیەندراوی بەندە

لە ناو ویلایەتی موسڵ قائیمقامی قەزای شەهربازار رەمزی ئەفەندی بەهۆی مردنیەوە، بۆ قائیمقامیەتی باسکراو بە چینی سێیەم، عەبدولقادر پاشا کە لە قائیمقامیەتی قەزای بازیان لە چینی دووەم کاری کردووە و لەگەڵ کەشوهەوای ئەوێ ئاویتە نەبووە داوای کردووە شوێنەکەی بگۆردرێت، ناوبراو بگوازرێتەوە، بۆ قائیمقامیەتی بازیانیش لە چینی ناوهاتوو لە مولازیمی هەڵبژێردراو قائیمقامی پێشووی ئاقچە حیسار ئیبراهیم نیازی ئەفەندی دابمەزرێت، لیستی چاکسازی بە ماددەی سێیەم جێگیر دەکرێن، هەروەها ئیبراهیم ئەفەندی کاغەزی وەرگێراوی زانیاری پەسەند کراوی هاوپێچ پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی هاوکاری سەدارەتپەناهی دەوێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٢ جەمادی یەکەم ١٣١٦ و لە ١٦ ئەیلوول ١٣١٤.

به ناوی نازری کاروباری ناوەخۆ


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1223 91717

| 1316 جەمادی کۆتایی 25 | 001223.091717 | BEO. |
|---|---|---|

٢٥ جەمادی کۆتایی ١٣١٦
٢٩ تشرینی یەکەم ١٣١٤
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
قائیمقامی بازیان عەبدولقادر پاشا، لە قائیمقامیەتی قەزای شەهربازار دامەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە لە مێژووی ١١ جەمادی یەکەم ١٣١٦ ژمارە ٢٧١٨ بە نووسراوی دەوڵەت و بریاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە بە مۆڵەتدان لە ٢١ جەمادی کۆتایی ١٣١٦ بە فەرمانی پاشا جەنابی خەلافەتپەناهی فەرموویەتی، بۆ جێبەجێ کردنی هیممەت بکرێت.



| BEO. | 001245.093335 | 29 رەجەب 1316 |
|---|---|---|

فەرمانگەی گشتی ئەرکانی جەنگی
یەکەی چوارەم
١٦٩٤
راگەیەندراوی بەندەمانە
هەمەوندەکان و شوانیەکان رووداو و سەرپێچیەکانیان یەك لە دوای یەك ئەنجام دەدەن، هۆزەکانی شێخ بزێنی پەیوەندی بە شوانیەکان کردووە، لەگەڵ ئەو نزیك بوونەوەی هۆزەکان ئامادەکاری سەربازی کراوە و پوختەکەی نێردراوەتە ویلایەتی موسڵ، ئەو کاغەزانەی بۆ لایەنی سەربازی رۆیشتووە، لەشکری شەشەمی هومایۆن لە موشیرەتی جەلیلە بە تەلەگرافنامەی بەندە خوێندراوەتەوە و راوبۆچوون وەرگیراوە، لە ٨ تشرینی دووەم ١٣١٤ ژمارە ١٥٧٧ بە نووسراو وەڵام دراوەتەوە و ئاماژەی پێکراوە، ئەمجارە لە موشیرەتی ناوهاتوو وەڵام هاتووە لە تەلەگرافنامەی مێژووی ٢٩ تشرینی دووەم ١٣١٤ ئەو مەفرەزەیەی لە چەمچەماڵە، بە تێکەڵاوی بهێنرێن بە پارچەکانی تر بلکێنرێن، لە شوێن ئەویش سێ بلۆك لە چەمچەماڵ و یەك بلۆکیش لە ئاغچەلەری نزیك چەمچەماڵ نیشتەجێ بکرێن، بۆ ئەم مەبەستەش تابوری یەکەمی ئالای ٤٦ نێردراوە، هەروەها لە ناوچەی چیاسەبزە شوێن نەماوە تاوەکو سەربازی تێدا نیشتەجێ بکرێت، ئەمەش بە ناردنی هەواڵ زانراوە، جگە لەمەش لە قەزای بازیان بۆ قوماندان و قوماندانیەتی میرێکی سەربازی لێهاتوو دامەزرێت، چونکە ئەم کارە سوودی دەبێت، بۆ دامەزراندنی میری سەربازی بۆ قائیمقامیەتی بازیان دەنگی لەسەر دراوە و بە گفتوگۆ لەگەڵ موشیری ناوهاتوو بۆ جێبەجێ کردنی لە بەندەمانەوە نووسراو بۆ سەدارەتپەناهی کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە کۆتایی رەجەب ١٣١٦ و لە ٢ کانوونی یەکەم ١٣١٤.
رزا سەر عەسکەر


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1249 93656 2

BEO.001249.093656.002

| BEO. | 001249.093656 | 17 شەعبان 1316 |
|---|---|---|

نەزارەتی کاروباری دارایی
ژمێریاری گشتی
ژمارە ٢١١٢
راگەیەندراوی بەندەتانە
لەشکری شەشەمی هومایۆن و ئەوەی لە نێوان چەمچەماڵ و سەر سنوورە لە سەربازی شاهانە بۆ پاراستنی کارگێریان، لە جێبەجێ کردنی ئاماژەکان، فەرمانبەرانی مولکیە و دارایی بە پەرۆشی پاراستنی بەرژەوەندیەکانیان، سەربازەکان ماوەی دوو رۆژە بێ ئەرزاقن، بۆیە بە ناچاری ئەو ١٠٠ لیرەیەی کە لەمێژە بۆیان تەرخان کراوە، رایانگەیاندووە کە بۆ دابین کردنی ئەرزاق خەرجیان کردووە، هەروەها لە ویلایەتی موسڵ کارگێری مولکیە و دارایی لەبەر ئەوەی ئەم بارودۆخە بەردەوامە، هەروەها پێویستیان بە چادرە بۆ ئەو لەشکرەی دادەمەزرێت، ئەمەش لەلایەن موشیری جەلیلەی ناوهاتوو بە تەلەگراف راگەیەندراوە، بۆ پاراستنی کارگێری سەربازی ئاگاداری بەپەلە لەلایەن سەر عەسکەرەوە دراوەتە دەفتەرداری ویلایەتی ناوهاتوو، بۆ ئەم مەبەستەش نووسراو لە ١٥ کانوونی یەکەم ١٣١٤ کراوە، ئەو برە پارەیەی کە هەژمار کراوە، تەواوی ئاقچەکە بدرێت، ئەمرۆ بە تەلەگرافنامە ئاگاداری دەفتەرداری ویلایەتی ناوهاتوو کراوە، نووسراویش کراوە، لە وەڵامیشدا لەلایەن واڵای سەر عەسکەرەوە راگەیەندراوە، هەروەها لە سەدارەتیشەوە بۆ والی ویلایەتی ناوهاتوو ئامۆژگاری پێویست نێردراوە، راگەیاندن و نووسراویش لە ژمێریاری گشتی باس کراوە و ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ١٧ شەعبان ١٣١٦ و لە ١٩ کانوونی یەکەم ١٣١٤
نازری دارایی



| 1316 شةعبان 25 | 001254.093986 | BEO. |
| --- | --- | --- |

٢٥ شەعبان ١٣١٦
٢٧ کانوونی یەکەم ١٣١٤
بۆ لایەنی والای سەر عەسکەر
سەرۆکی فرقەی هەمائیلی هەمەوەندەکانە، بەم دواییە لە نێوان هەمەوەندەکان و تاڵەبانیەکاندا رووبەرووبوونەوە روویداوە، عەلی فەتاح ئەفەندی بۆ بازیان هیجرەتی کردووە، بەو مەرجەی باجەکانی میری بدات، لەگەڵ ٣٥ کەس لە خانەوادە و نزیکەکانی بەیەکەوە بە مەبەستی نیشتەجێ بوون، لە دەوروبەری موسڵ شوێنێکیان بۆ دابین دەکرێت، بە گوێرەی ئەو کارە لە سلکی ژاندارمە ناونووس دەکرێن و داوای کردووە مووچەیان لە مەرکەزی ویلایەت سندوقی دارایی پێ بدرێت، بۆ ئەم مەبەستە ئەو نووسراوانەی بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلەی ویلایەتی موسڵ هاتووە لەگەڵ نووسراوی نەزارەتی ناوهاتوو لە مێژووی ٢١ شەعبان ١٣١٦ ژمارە ٤٢٤١ بەیەکەوە بۆ والای سەر عەسکەر نێردراوە، لە یەکەم کاردا بە تێروانین لە خوێندنەوەی فەرمانگەی جەلیلەی سەر عەسکەر کاغەزەکان دەنێردرێتەوە.




| | | |
|---|---|---|
| 3 رەمەزان 1316 | 001257.094207 | BEO. |

٣ رەمەزان ١٣١٦
٣ کانوونی دووەم ١٣١٤
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
ئـەو تابـورەی لـە چەمچەماڵـە لەگـەڵ ئەرزاقی سـەربازی بەرێکراون، ئـەو کاروانەی کـە کەلوپەلی خەڵکـی هەڵگرتووە لەگـەڵ مەفرەزەکـە ڕۆیشـتوون، لـە دووری دوو کاتژمێـر لـە کەرکـووك لـە هـۆزی شـوان زیاتـر لە ٣٠٠ ئەسـپ سـوار و پیـادە چەتـە هێرشـیان کـردووە، لەگـەڵ مەفـرەزەی سـەربازی مـاوەی پێنـج کاتژمێـر شـەڕیان کـردووە، دواتـر ئەرزاقـی سـەربازی و بەشـێکی کاروانەکـە لەنـاو چـوون لـە بەرامبـەر ئـەوەدا لـە کەرکـووك و چەمچەمـاڵ لـە هـەر یەکـە مەفرەزەیـەك لەگـەڵ ٤٥ پۆلیس هاتـوون، لـە قوماندانیەتـی خۆچێـی ڕاگەیەنـدراوە، ئەگـەری ئـەوە هەیـە ئەوانـەی بوێـری ئـەو کارەیـان کـردووە بـۆ مەملەکەتـی خۆیـان ڕۆیشـتوون، هەروەهـا وەڵام هاتووە لەسـەر بوێری هۆزی شـوان تـا دوا ئامـاژەی کـە کـراوە مەفـرەزە نەچۆتـە نـاو شـوان، موشـیرەتی لەشـکری شەشـەم ئاماژەی پێکـردووە، نـووسراوی مێـژووی ٢٨ شـەعبان ١٣١٦ ژمـارە ١٨١٢ بـۆ دەوڵـەت نێـردراوە، لـە سـەر عەسـکەر پرسـی لەسـەر کـراوە، بـە تێروانیـن لـەم پرسـە هیممـەت بکرێـت تـا خوێندنـەوەی بـۆ بکرێـت و بەپەلـە ڕەوانـە بکرێتـەوە.


i.DH. 1359/1316.C/39
9

İ.DH.01359

<table>
<tr><td>I.DH.</td><td>01359.000009</td><td>24 جەمادی یەکەم 1316</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە<br>ژمارە ٢٤٦<br>نوسراو لە مێژووی ١٦ ئەیلوول ١٣١٤ ژمارە ٢٧١٨ لە نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە بۆ قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە حەواڵە کراوە، لە یەك دەستەواژەیدا لە ویلایەتی موسڵ قائیمقامی قەزای شەهربازار، رەمزی ئەفەندی بەهۆی مردنیەوە، لە چینی سێیەم بۆ قائیمقامیەتی ناوهاتوو، قائیمقامی قەزای بازیان لە چینی دووەم دانراوە، بەڵام لەگەڵ کەشوهەوای ئەوێ ئاوێتە نابێت، بۆیە داوا کراوە عەبدولقادر پاشا بگوازرێتەوە.<br>لە کاتی ووردبینی لە زانیاری ناوبراو هیچ شتێك نەدۆزراوەتەوە رێگر بێت لە دەست بەکار بوونی، بۆیە بە ئاماژەکردن کارەکەی پەسەند کرا و نووسراوی بۆ کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>٢٤ جەمادی یەکەم ١٣١٦ و ٢٩ ئەیلوول ١٣١٤</td></tr>
</table>




DH.MKT.02129.00063.001

<table dir="rtl">
<tr><th>DH.MKT.</th><th>02129.00063</th><th>22 جه‌مادی كۆتایی 1316</th></tr>
<tr><td colspan="3">٢٢ جه‌مادی كۆتایی ١٣١٦<br>٢٦ تشرینی یه‌كه‌م ١٣١٤<br>بۆ جه‌نابی سه‌داره‌تپه‌ناهی<br>هه‌ر یه‌كه سنووری خۆی ده‌به‌زێنی، بۆ چاك كردنی په‌یوه‌ندی نێوان هه‌مه‌وه‌نده‌كان و شوانه‌كان له‌سه‌ر ئاماژه‌ی موته‌سه‌رفیه‌تی خۆچێی فه‌رمانبه‌رانی سوڵحكردن نێردراونه‌ته قه‌زای بازیان، هۆزی شێخ بزێنی چوونه‌ته پاڵ شوانه‌كان، ئێستا بۆ جێبه‌جێ كردنی كاره‌كه كاغه‌زی په‌یوه‌ست به سوڵحه‌كه‌یان كه‌وتۆته ژێر ده‌ست، موته‌سه‌رفه‌كانی ناوبراو له‌گه‌ڵ فه‌رمانبه‌رانی باسكراو ئاماژه‌ی پێكراوه، له‌به‌ر كۆمه‌ڵێك سه‌ركه‌وتن كه له‌لایه‌ن جه‌نابی پاشا هاتۆته دی، ئه‌و ته‌له‌گرافنامه‌یه‌ی له مێژووی ٢٣ ئه‌یلوول ١٣١٤ له ویلایه‌تی موسڵی جه‌لیله هاتووه له‌گه‌ڵ نووسراوی به‌نده‌مان پێشكه‌ش كراوه، ئه‌و كاغه‌زانه‌ی كه ناوبراو ناردوویه‌تی، له‌گه‌ڵ ئه‌و مه‌رجانه‌ی جێبه‌جێ كراوه، پوخته‌ی ئاماده‌كاریه‌كانی سه‌ربازی هه‌روه‌ها له‌گه‌ڵ هه‌ندێك ووته ئه‌مجاره له ویلایه‌تی ناوهاتوو هاوپێچ نووسراوه‌كان له ٣ تشرینی یه‌كه‌م ١٣١٤ پێشكه‌شی سه‌داره‌تپه‌ناهی كراوه.</td></tr>
</table>



| DH.MKT. | 02143.00010 | 19 ڕەجەب 1316 |
|---|---|---|

١٩ ڕەجەب ١٣١٦
٢١ تشرینی دووەم ١٣١٤
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
لە ناو ویلایەتی موسڵ قائیمقامی قەزای شەهربازار مردووە، بۆیە لە شوێن ئەو عەبدولقادر پاشا قائیمقامی بازیان بگوازرێتەوە، لەگەڵ گواستنەوەی ئەو قائیمقامی ئاقچە حیسار ئیبراهیم نیازی ئەفەندی بۆ قائیمقامیەتی بازیان دابمەزرێت، هەر خۆی لە خۆیدا نووسراوی سەدری ئەعزەمی سەدارەتپەناهی لە مێژووی ٣ تشرینی یەکەم ١٣١٤ ژمارە ٢٤٩٥ کە تێدا هاتووە نیازی ئەفەندی لە چینی سێیەم هەڵبژێردراوە، هەروەها بە تێروانین لە هەندێك تۆمار دەرکەوتووە بە بڕیاری قۆمیسیۆنی مولکیەی فەرمانبەران بۆ قائیمقامیەتی بازیان دامەزراندنی ئەوی تر ئاماژەی پێکراوە و ڕاگەیەندراوە، ئەمجارە لە ویلایەتی موسڵ ئەو نووسراوانەی لە ویلایەتی موسڵ هاتووە هەمەوەندەکان و شوانەکان بۆ چاکسازی و ئاشتکردنەوەی نێوانیان بکرێت و بۆ بەردەوام بوونی ئەوەش بۆ قائیمقامیەتی بازیان یەکێك لە میرەکانی سەربازی دابنرێت، هەروەها لە قەزای بازیان تابوری دووەم لە ئالای ٤٥، بینباشی حاجی ئەمین ئەفەندی دەرکەوتووە کەسێکی لێهاتوو و گرنگە، بە پشت بەستن بەمە عەبدولقادر پاشا بۆ شەهربازار بگوازرێتەوە و بۆ قائیمقامیەتی بازیانیش بە پێویست زانراوە کە ئەمین ئەفەندی دابمەزرێت، لە کۆتاییشدا بە فەرمانی پاشا فەرموویەتی جێبەجێ بکرێت.



| 1316 شەعبان 21 | 02156.00034 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢١ شەعبان ١٣١٦
٢٣ کانوونی یەکەم ١٣١٤
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی

کاتی خۆی وەکو سەرکردەکانی تر بۆ ئەوەی کەسوکار و نزیکەکانی تووشی ڕووداوێك نەبن بە مەرجی نیشتەجێ بوون لە کەرکووك نیشتەجێ بووە، مانگانەش ١٠٠٠ قوروش مووچەی بۆ براوەتەوە، لەم دواییە لەبەر مەسەلەی کوشتن و تاڵانکردنی نێوان تاڵەبانیەکان و هەمەوندەکان کەرکووکی بەجێ هێشتووە و چۆتە بازیان، بە مەرجی جێبەجێ کردنی، پێشنیاری میری کەسوکار و نزیکەکانی کە لە ٣٥ کەس پێك هاتوون، کە بەیەکەوە نیشتەجێ بکرێن، لە چواردەوری موسڵ شوێنێك دابین بکرێت و بە گوێرەی کارەکە لە ژاندارمە تۆمار بکرێن و مووچەیان لە سندوقی دارایی ویلایەت دابین بکرێت، ئەمەش لەلایەن عەلی فەتاح سەرۆکی فرقەی هەمائیلی هەمەوەند داواکراوە، بۆ ئەمەش سەرۆکی ناوهاتوو لەوێ نیشتەجێ کراوە و مووچەکەشی لە سندوقی دارایی ڕێکخراوە و هۆکاری جێبەجێ کردنیشی تەواو بکرێت، نووسراو لە مێژووی ٢١ تشرینی دووەم ١٣١٤ ژمارە ١٣٧ لە پلەوپایەی ویلایەتی موسڵ وەرگیراوە، بە هاوپێچ پێشکەش کراوە، بە تێروانین لە وێنەیەکی ئەو ڕاگەیەندراوە جێبەجێ کردن و ڕاگەیاندنی ڕاوبۆچوونی وەکالەتپەناهیە.




| DH.MKT. | 02194.00038 | 18 جەمادی یەکەم 1316 |
| --- | --- | --- |

١٨ جەمادی یەکەم ١٣١٦
١٧ نیسان ١٣١٥
بۆ ویلایەتی موسڵی پایەبەرز

بە پشت بەستن بە نەریتی هۆزگەرێتی بۆ ئاشت کردنەوەی نێوان هەمەوەندەکان و شوانەکان، ئەو پەیمانەی بە گوێرەی بەرژەوەندی بەستراوە، بۆ ئەوەی بەردەوام بێت و پارێزراو بێت، یەکێك لە میریەکانی سەربازی قائیمقامیەتی بازیان دەستەی بەرژەوەندیەکە چاوپێداخشاندنەوەی پێ بکرێت و هەروەها لە قەزای بازیان بینباشی حاجی ئەمین ئەفەندی لە تابوری دووەمی ئالای ٤٥ دابمەزرێت، بۆ ئەمەش لە پایەی ویلایەت لەسەر نووسراوی ٣ تشرینی یەکەم ١٣١٤ کە هاتووە، عەبدولقادر پاشا بۆ قائیمقامیەتی شەهربازار بگوازرێتەوە و لە کۆتایی فەرمانی پاشای جەنابی پاشا فەرموویەتی، هەروەها بۆ قەزای بازیانیش کەسێکی گونجاو نەدۆزراوەتەوە، بۆ ئەوێش لە لایەنی سەربازیەوە قائیمقامێك دابمەزرێت، حاجی ئەمین ئەفەندی بۆ دەستکردن بە ئەرکەکەی لە سەدارەتپەناهی راگەیەندراوە و ئاماژەی پێکراوە، ناوبراو لەگەڵ کەشوهەوای چەمچەماڵ ناگونجێت مانەوەشی لە قائیمقامیەتی بازیان باش نییە، بە وەڵام بە لایەنی والای سەر عەسکەر راگەیەندراوە و نووسراوی ٢٨ نیسان ١٣١٤ نووسراوەتەوە و بۆ قائیمقامیەتی ناوهاتوو نێردراوە.


ŞD.00979.00029.002

| ŞD. | 00979.00029 | 13 شەوال 1317 |
|---|---|---|

کاتیبی ناسنامەی قەزای بازیان عەبدولقادر ئەفەندی مردووە، لەلایەن خێزانەکەی فاتیمە و کچەکەی عاسیمە خان داوایان کردووە مووچەیان بۆ ببڕێتەوە، نووسراو دراوەتە ویلایەتی موسڵ، لەگەڵ داواکاریەکە ماوەی خشتەی خزمەت و کاغەزی جیاجیای ئەو بابەتە لە ژمێریاری پەراوێزی بۆ رێکخراوە، لە دەستەی گشتیش وردبینی بۆ کراوە.
مێژووی ئەو ماوەیەی کە ناوبراوی مردوو ئەرکەکانی وەرگرتووە لەگەڵ ئەو برە مووچەیەی کە وەریگرتووە لە مێژووی ٢٣ شوبات ١٣١٣ مردووە، بە بریارنامەی خانەنشینی فەرمانبەرانی مولکیە ماددەی ٣٥ و ٣٦ و ٣٩ دوای زیاد کردن و کەم کردنەوە ئەوەی شایەنینە مووچەی ٦٠ قوروشە، بە یەکسانی لە نێوانیان دابەش دەکرێت، کە بۆ هەر یەکە ٣٠ قوروشیان بەر دەکەوێت، لە بارەی مووچەی دیاریکراو بە ماددەی ٣٥ مامەڵەکە جێبەجێ دەکرێت، بۆ ئەمەش نووسراو بۆ سندوق کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ١٣ شەوال ١٣١٧ و لە ١ شوبات ١٣١٥


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
1360 101994 8

BEO.001360.101994.008

| BEO. | 001360.101994 | 10 ڕەبیعی کۆتایی 1317 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە
ژمارە ٢٠٧

لە مێژووی ٢٥ تەممەوز ١٣١٥ ژمارە ٢٠٧٦ نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە حەواڵەی قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە بووە، خوێندراوەتەوە.

بۆ قائیمقامیەتی قەزای بازیان ئاڵای نیزامیەی ٤٥، قائیمقامی قاسم بەگ بۆ دامەزراندن و ڕۆیشتنی داوا لە ویلایەتی موسڵ کراوە، خۆشی لەبەر سەرکەوتنی چۆنیەتیەکەی لە موشیرەتی لەشکری شەشەمی هومایۆن پرسیار کراوە، دوای ڕاگەیاندنی بۆ جێبەجێ کردنی نووسراوی هاوپێچ لە واڵای سەر عەسکەر نووسراوەتەوە، دوای ووردبینی بە تۆمار دەرکەوتووە قائیمقامی قەزای ناوبراو عەبدولقادر پاشا مردووە و بۆ قائیمقامیەتی ناوهاتوو بە ئاماژەپێکردنەوە نیشانی داوە قاسم بەگ دامەزراوە.

ئەگەرچی لەبەر گرنگی و تایبەتمەندی شوێنەکە وا نیشان دراوە بۆ قائیمقامیەتی هەندێك لە قەزاکان ئەفسەری سەربازی دابمەزرێت، بەڵام تۆمار نەکراوە و ئاماژەی پێنەکراوە ئاخۆ لەوێ پێویست بە شتێکی ئاوا دەکات یاخود نا، بە تێروانین لەو ووردبینیانەی کە کراوە، بۆ ئەرکی قائیمقامیەتی قاسم بەگ لەبەر ئەوەی سەردانی موشیرەتی لەشکری هومایۆنی جەلیلە نەکردووە و لە فەرمانبەرایەتی مولکیە داوای قائیمقامیەتی قەزای ناوهاتووی نەکردووە، لێرە بە گوێرەی ئەو ئاماژەی کە پێشووتر هاتووە، هەروەها لە قەزای ناوهاتوو لە چینی دووەم و ئەو قائیمقامانەی ئەمجارە هەڵبژاردننامە و بروانامەی مۆڵەتی بەکارهێنانیان دەست نەکەوتووە، لەوانە ئەوانەی ئەرکیان پێ دەدرێت لەسەر فەرموودەی سەروو دەبێت، بۆ هەڵبژاردنی ئەوانە نووسراو حەواڵەی نەزارەتی ناوهاتوو کراوە، نووسراوی باسکراو دووبارە پێشکەش کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

لە ١٠ ڕەبیعی کۆتایی ١٣١٧ و لە ٥ ئۆغستۆس ١٣١٥


İ.DH.01370

| I.DH. | 01370.000008 | 16 رەجەب 1317 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
٢٠٨١
بۆ جەنابی ئەفەندیم
لـە نـاو ویلایەتـی موسـڵ بە ئاماژەی ویلایـەت لەبـارەی دامەزراندنـی قائیمقامی ئاڵای ٤٥، قاسـم بـەگ بۆ قائیمقامیەتـی قەزای بازیـان، بریارنامـەی قۆمیسـیۆنی فەرمانبەرانـی مولکیـە لەگەڵ نـووسراوی نەزارەتـی ناوەخۆی جەلیلـە بەیەکەوە راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، فەرمانـی پاشـای جەنابـی خەلافەتپەناهـی هـەر چ بفەرمووێـت جێبەجـێ دەکرێـت، نـوسراو ژمـارەی بـۆ دانرا ئەفەنـدم، لـە ١٦ رەجـەب ١٣١٧ و ٨ تشرینـی دووەم ١٣١٥.
سەدری ئەعزەم




| | | |
|---|---|---|
| BEO. | 001407.105516 | 21 ڕەجەب 1317 |

٢١ ڕەجەب ١٣١٧
١٣ تشرینی دووەم ١٣١٥
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە و لایەنی والای سەر عەسکەر
تایبەت بە دامەزراندنی قائیمقامی نیزامیەی ئالای ٤٥، قاسم بەگ بۆ قائیمقامیەتی قەزای بازیان لەسەر نووسراوی دەوڵەت لە مێژووی ٢٤ جەمادی کۆتایی ١٣١٧ ژمارە ٣٣٤٨ بە بڕیاری قۆمیسیۆنی مولکیەی فەرمانبەران بە مۆڵەت دان لە مێژووی ١٨ ڕەجەب ١٣١٧ فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی فەرموویەتی، زانیاری دراوەتە لایەنی والای سەر عەسکەر، بۆ جێبەجێ کردنی هیممەت بکرێت.



| | | |
|---|---|---|
| 1317 شەوال 26 | 001447.108500 | BEO. |

٢٦ شەوال ١٣١٧
١٤ شوبات ١٣١٥
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
لـە داهاتـی لەشکری شەشـەمی همایـۆن بـۆ ئـەوەی بـە پەلـە ڕێـك بخرێـت، حەواڵـە کـراوە، بـە ئـاگادار کردنـەوەی فەرمانبەرانـی دارایـی ویلایـەت جێبەجـێ کـراوە و لەسـەر وەڵامـی نـووسراوی مێـژووی ١٢ شـەوال ١٣١٧ ژمـارە ٢٢٨٩ بـۆ لاینـی والآی سـەر عەسـکەریە ئـاگادار کراوەتـەوە، ئەمجـارە لـە سـەر عەسـکەری ناوهاتوو نـووسراو لە مێـژووی ٢٠ شـەوال ١٣١٧ ژمـارە ١٠٤٦ نێـردراوە، لـە تابورەکانـی کەرکـووك و چەمچەماڵ ئەو سـەربازانەی کە ئەرکـی فەرمانبەرێتی سـەربازیان تـەواو کـردووە، مووچەکانیـان نـەدراوە، ئەمـەش کاریگـەری بەسـەر ملکـەچ بوونـی ئـەو کەسـانە دەبێـت کـە لـە ئەرکـی سـەربازین، بەمـەش هەسـتاون تێکەڵـی کاری هەڵبـژاردن بوونـە، لەبـەر ئـەوە لـە ویلایـەت ١٢٠ هەزار قـوروش کـە داوایـان کـردووە نایاندرێتـێ، ئەمـەش بـە شـێوەیەکی تـەواو دەرکەوتـووە، بـۆ جێبەجـێ کردنـی ئـەم کارە ئەمجـارە لـە موشـیرەتی لەشـکری ناوهاتـوو ئامـاژەی پێکـراوە، هەروەها لەم شـوێنانە پارچەکانـی سـەربازی بەیەکەوە بەسـتراونەتەوە، هەروەهـا کارگێـری فرقـەی ١٢ی همایـۆن ماوەیەکـە کەوتوونەتـە نـاو کێشـەوە، لـەم بارەیـەوە بـە گوێـرەی ئاماژەکان بـۆ ئـەوەی نیشـان بدرێـت بـە چ شـێوەیەك دابیـن دەکرێـت، ئـەوا لـە ویلایەتـی بەغـداد ئـەو بـڕە پارەیـەی کـە حەواڵـە کـراوە، بـە گوێـرەی پێویسـت هەرچـی زووە کارەکـە جێبەجـێ بکرێـت، بـە تێڕوانین لـە چۆنیەتی جێبەجـێ کردنیشـی ئەنجامەکەشـی ڕابگەیەنرێـت و هاوپێـچ هیممـەت بکرێـت بـە ناردنەوەی.



| | | |
|---|---|---|
| 13 موحەررەم 1317 | 02206.00055 | DH.MKT. |

١٣ موحەررەم ١٣١٧
١٢ مایس ١٣١٥
بۆ ویلایەتی موسڵ
لەلایەن هۆزەکانی هەمەوەند و شوان هێڵی تەلەگرافی چەمچەماڵ و کەرکووك تێك دراوە، بۆچاککردنەوەی ئەو هێڵە، چاوشی تەلەگراف ڕۆیشتووە بۆ پارێزگاری کردن لەم چاوشە لە حکوومەتی خۆچێی پۆلیس هاوەڵی کردووە، بەڵام ئەو پۆلیسانە بوێریان نەکردووە تا شوێنی وێران کراوەکە لەگەڵی بڕۆن، لە نیوە ڕێگا گەڕاونەتەوە، هەروەها دووبارە لە ڕۆیشتنەوەیان پارێزەرانی چاوش بە هەنگاو ئاگاداری حکوومەتیان کردۆتەوە، بەڵام هیچ ئەنجامێکیان بەدەست نەهێناوە، جگە لەوە ئەو هۆزە ناوبراوانە بەردەوام دەستدرێژی دەکەنە سەر هێڵی تەلەگراف و چاوشەکان، بۆیە لە کاتی سەردانی موشیرەتی لەشکری هومایۆنی شەشەمی ویلایەت لە باش مودیریەتی تەلەگراف و پۆستەی بەغداد ڕاگەیەندراوە، بۆ جێبەجێ کردنی لە نەزارەتی تەلەگراف و پۆستەی نووسراو لە مێژووی ٢٦ نیسان ١٣١٥ ژمارە ١١٠ نێردراوە، کە پێویستە لەگەڵ پارێزگاری کردن لە هێڵی تەلەگراف ئامادەکاری کاریگەر جێبەجێ بکرێت و دابین بکرێت، لە ڕووی یاساییەوە هیممەت بکرێت بۆ جێبەجێ کردنی کارەکان.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
2230 5

DH.MKT.02230.00005.001

<table>
<tr><th>DH.MKT.</th><th>02230.00005</th><th>29 ره‌بیعی یه‌كه‌م 1317</th></tr>
<tr><td colspan="3">٢٩ ره‌بیعی یه‌كه‌م ١٣١٧<br>٢٥ ته‌مموز ١٣١٥<br>بۆ جه‌نابی سه‌داره‌تپه‌ناهی<br>بـۆ قائیمقامیه‌تـی قـه‌زای بازیـان، قاسـم بـه‌گ لـه‌ قائیمقامـی ئـاڵای نیزامیـه‌ی ٤٥ دامه‌زرێـت و ره‌وان بكرێـت، لـه‌ ویلایه‌تـی موسـڵ داواكراوه‌ و خۆشـی بـه‌م كاره‌ رازی بـووه‌، چۆنیه‌تی كاره‌كه‌ش پرس به‌ موشـیره‌تی جه‌لیله‌ی له‌شـكری شه‌شـه‌می هومایـۆن كـراوه‌، بـه‌ راگه‌یاندنـی جێبه‌جـێ كـردن و ئامـاژه‌ پێكردنـی له‌لایـه‌ن والای سـه‌ر عه‌سـكه‌ره‌وه‌ نـووسراو لـه‌ مێـژووی ٣٠ حوزه‌یـران ١٣١٥ ژمـاره‌ ١٣٣ هاتـووه‌، دوای ووردبینـی بـه‌ تۆمـار ده‌ركه‌وتـووه‌ قائیمقامـی قـه‌زای ناوهاتـوو عه‌بدولقـادر پاشـا مـردووه‌، بـه‌ نووسراوێكیـش بـۆ قائیمقامیه‌تـی ناوهاتـوو قاسـم بـه‌گ دامـه‌زراوه‌، نـووسراوی ناوهاتـوو پێشكه‌شـی جه‌نابـی سـه‌داره‌تپه‌ناهی كـراوه‌، بـۆ جێبه‌جـێ كردنـی هـاوكاری وه‌كاله‌تپه‌ناهـی ده‌وێـت.</td></tr>
</table>




| 24 جەمادی کۆتایی 1317 | 02263.00026 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٤ جەمادی کۆتایی ١٣١٧
١٧ تشرینی یەکەم ١٣١٥
بۆ لایەنی والای جەنابی سەر عەسکەر لەگەڵ ویلایەتی موسڵ
لە مێژووی ٢٣ ئەیلوول ١٣١٥ وەڵامی تەلەگرافنامەیە، بۆ قائیمقامیەتی مەعمورەی حەمیدیە و بازیان قائیمقامیەتی سەربازی ئەمین بەگ و قاسم بەگ ئەرکیان پێ بدرێت، لە پلەی والای سەر عەسکەر پێشەکی ئاماژەی پێکراوە، بۆ سەدارەتپەناهی نووسراوەتەوە، جێبەجێ کردنی راگەیەندراوە.



| 24 جەمادی کۆتایی 1317 | 02263.00061 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٤ جەمادی کۆتایی ١٣١٧
١٧ تشرینی یەکەم ١٣١٥
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
دامەزراندنی قائیمقامی ئالای ٤٥ی نیزامیە قاسم بەگ بۆ قائیمقامیەتی قەزای بازیان، لە وەڵامی ئەو مۆڵەتەی پێشوو هاتووە نووسراوی سەدری ئەعزەمی سەدارەتپەناهی لە مێژووی ١٢ ئۆغستۆس ١٣١٥ ژمارە ١٧١٢٠ لەبەر ئەوەی قەزاکە بەهۆی شوێنی جوگرافی گرنگی و تایبەتمەندی تایبەتی خۆی هەیە، ئەگەرچی بڕیاردراوە لەسەر ئەوەی ئەفسەری سەربازی وەکو قائیمقام دابمەزرێت، بەڵام هیچ نیشانە و هێمایەك نییە کە ناچار بکرێت کەسێك لەم لایەن دابمەزرێت، هەروەها دەبێ هەڵبژێردراو بێت و بروانامەی پەسەند کراو بێت، جگە لەوە خاوەن کەسایەتی و دەسەڵات بێت، بۆ ئەمەش پێویستی بە فەرمانی جەنابی پاشای جەنابی پاشایە، واتە ئەو کەسانەن کە دەرچووی مەکتەب و هەڵبژێردراو یاخود لە قائیمقامیەت بەکار هات بێت، ئەمەش بە فەرموودەی پاشا کەسێکی هەڵبژێردراو بە بڕیارنامەی قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە نووسراوەتەوە و کەسێك هەڵبژێردرێت دەرچووی مەکتەب بێت یاخود هەڵبژێردراو بێت، بۆ قەزای بازیان قاسم بەگ و بۆ مەعمورەی حەمیدیە قائیمقامی ٣٥ی ئالای سوارە ئەمین بەگ وەکو قائیمقام دابمەزرێن، ئەمەش لەلایەنی ئالای سەر عەسکەر پەسەند کراوە و لە کاتی ووردبینی بۆ قائیمقامیەتی بازیان قاسم بەگ دابمەزرێت بۆ ئەمەش نووسراو بە تەلەگرافنامە لە ویلاتەوە پێشکەش کراوە.




DH.MKT.02292.00100.001

<table>
<tr><th>DH.MKT.</th><th>02292.00100</th><th>29 شەعبان 1317</th></tr>
<tr><td colspan="3">٢٩ شەعبان ١٣١٧<br>٢٠ كانوونی یەكەم ١٣١٥<br>بۆ نەزارەتی دەرەوەی جەلیلە<br>دوای ئەنجامدانـی تاوانێكـی زۆر لـە ئێـران، فەقـی شـێخ سـەعید و بـرادەری شـێخ قـادر بـۆ مەمالیكـی شـاهانە هەڵاتـوون، بـۆ تەمبێ كردنـی ناوبـراوان نـوسراو دراوەتـە باڵیـۆزی ئێـران، لـەم راپۆرتـە داوای ئەنجامدانـی كـراوە، بـۆ جێبەجـێ كردنـی لـە مێـژووی ٢٠ نیسـان ١٣١٤ لـە نـووسراوی سـەدری ئەعـزەم نووسراوەتـەوە، بـە گفتوگـۆ شـێخی ناوبـراو سـەرەتا هاتۆتـە قـەزای بازیـان لـە ناحیـەی سـەنگاوە ماوەیـەك لـە گونـدی گـۆك تەپـە ماوەتـەوە، بـەم دواییـە لەوێـش تاقمێـك تاوانـی ئەنجـام داوە، سـاڵی رابـردوو دووبـارە بگەڕێتـەوە ئێـران، ئەمـڕۆ لە شـوێنێك بە نـاوی جیكـران نیشـتەجێیە، لـە وەڵامـی ویلایەتـی موسـڵ نـووسراو لـە مێـژووی ١٥ تشرینـی دووەم ١٣١٥ ژمـارە ٨١ نووسراوەتــەوە.</td></tr>
</table>




<table>
<tr><td>19 رەمەزان 1317</td><td>02298.00014</td><td>DH.MKT.</td></tr>
<tr><td colspan="3">١٩ رەمەزان ١٣١٧<br>٨ کانوونی دووەم ١٣١٥<br>بۆ لایەنی جەنابی سەر عەسکەری واڵا<br>ئەمجارە بۆ قائیمقامیەتی قەزای بازیان، قائیمقامی ئالای ٤٥ی نیزامیە کۆتایی پێ بێت و بە بریار قاسم بەگ دامەزرێت، بەم جۆرە لە فەرمانبەرانی مولکیە بە مووچەی میری سەربازی دامەزرێت و بە گوێرەی ئەمەش مووچەی مولکی یاخود سەربازی کامە زیاتر بێت ئەویان دابین دەکرێت، بۆ جێبەجێ کردنی مامەڵەکەش تا لای موشیر دەروات، کە مووچەی ئەفسەر و میرەکانی سەربازی مووچە و دامەزراندنیان بە شوێنگرەوەش چەند قوروش زیاتر بێت دیاریکراوە و بە پارچەیەك ڕێکخراوە و بە ووتەی ژمێریاری دەنێردرێت.</td></tr>
</table>

| DH.MKT. | 02299.00085 | 24 ڕەمەزان 1317 |
|---|---|---|
| ٢٤ ڕەمەزان ١٣١٧<br>١٣ کانوونی دووەم ١٣١٥<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>بـۆ قائیمقامیەتـی قـەزای بازیـان قاسـم بـەگ قائیمقامـی سـەربازی لەبـەر ئـەوەی ناچێتـە پـاڵ هـۆزەکان و هەمەوەنـدەکان پلەیـەک زیاتـر جانەوەربوونیـان دەردەکەوێـت، لـە بـارەی مانـەوەی بریـکاری قائیمقـام قـادر ئەفەنـدی لەلایـەن سـەرۆکی هـۆزی هەمەوەنـد زانیـاری بـۆ سـەدارەتپەناهی ڕۆیشـتووە، ئـەو تەلەگرافنامەیـەی حەواڵـە بـووە، نێـردراوە، لـە ویلایـەت بـە پێویسـت زانـراوە قاسـم بـەگ لـە قائیمقامیەتـی قـەزای بازیـان ئەرکەکەی پـێ بسـپێردرێت، ئەمـەش بـە تۆمـار دەرکەوتـووە، هەروەهـا بـە تێروانیـن لـە ووردبینـی تەلەگرافنامـەی ناوهاتوو بۆ جێبەجـێ کردنـی لـە سـەروو خوێندراوەتـەوە. | | |




| DH.MKT. | 02304.00017 | 11 شەوال 1317 |
|---|---|---|
| ١١ شەوال ١٣١٧<br>٣٠ کانوونی دووەم ١٣١٥<br>بۆ لایەنی جەنابی والای سەر عەسکەر<br>مێژووی ١٨ کانوونی یەکەم ١٣١٥ ژمارە ٤١٩٩ وەڵامی نووسراوی سەر عەسکەر، قائیمقامی ئالای ٤٥ قاسم بەگ لەسەر نووسراوی مێژووی ٣٠ حوزەیران ١٣١٨ سەر عەسکەر بە مۆڵەت وەرگرتن لە ١٤ تشرینی دووەم ١٣١٥ فەرمانی پاشا، لە قائیمقامی بازیان دامەزراوە، بە تۆمار دەرکەوتووە، راگەیەندراوە. | | |




| ŞD. | 00985.00060 | 14 جەمادی کۆتایی 1318 |
|---|---|---|

نەزارەتی سندوقی خانەنشینی مولکیە و دوورخراوان
قەڵەمی نووسین
ژمارە ٥٠٤
قائیمقامی پێشووی بازیان عەبدولقادر پاشا مردووە، لەلایەن خێزانەکەی خەدیجە خان و کچەکانی فەهیمە و شەمسە و حەفسە خان و کورەکەی محەمەد ئەفەندی داوایان پێشکەش کردووە تا مووچەیان بۆ ببرێتەوە، لە ویلایەتی موسڵ بە نووسراو نێردراوە، لەگەڵ داواکاریەکە خشتەی ماوەی خزمەت و کاغەزی پەیوەندیدار بەم بابەتە لە ژمێریاری پەراوێزی بۆ رێکخراوە، لە دەستەی گشتی ووردبینی بۆ کراوە.
مێژووی ئەو ئەرکانەی وەریگرتووە لەگەڵ بری مووچەکانیان لە مێژووی مردنیەوە کە دەکاتە ٢١ تشرینی دووەم ١٣١٤ بە بریاری خانەنشینی فەرمانبەرانی مولکیە ماددەی ٣٥ و ٣٦ و ٣٩ دوای زیادکردن و کەم کردن ئەوەی شایەنیانە ٢١٠ قوروش مووچەیە، لە نێوانیان بە یەکسانی دابەش دەکرێت، هەر یەکە ٣٥ قوروشی بەر دەکەوێت، مووچەی ناوهاتوو بە گوێرەی ماددەی ٣٥ مامەڵەکەی جێبەجێ دەکرێت، بۆ دابینکردنی لە سندوق نووسراو کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
١٤ جەمادی کۆتایی ١٣١٨ و ٢٦ ئەیلوول ١٣١٦




| BEO. | 001645.123333 | 26 ڕەمەزان 1318 |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>وەڵامی فەرماننامەی ۷ تشرینی دووەم ۱۳۱٦ ژمارە ۱۱۸یە، قاسم بەگ قائیمقامی بازیان لە هەردوو لا مووچەی پێ نادرێت، بۆیە داوای کردووە بگەڕێتەوە ئالای، هەروەك لە موشیرەتی جەلیلە ڕاگەیەندراوە، ناوبراو لە قەزای ناهاتوو لە بەڕێوەبردنی کارگێری سەرکەوتوو نەبووە، کۆتایی هێنانی لە موتەسەرفیەت ڕاگەیەندراوە، لە کۆتاییدا دەستەی پشکنین چۆتە قەزای ناوهاتوو، لەم بارەیەوە بە وێنەیەکی تایبەتی پشتگیری ئەو مەسەلەی کردووە، لە نووسراوی سەروو لە مێژووی ۱۷ نیسان ۱۳۱۵ ژمارە ۳۱ فەرمان دەرکراوە، بۆ ئەم قەزایە کەس ئارەزووی دامەزراندنی نییە، کەسانی هەڵبژێردراو و هەڵنەبژێردراو لە بەکارهێنراو و دوورخراوان هەروەها لە میرانی سەربازی بۆ ئەم کارە پێشنیاریان بۆ دەکرێت قەبوڵی ناکەن، جگە لەمە ناوبراویش بە نەگونجاو دانراوە کە نەمێنێتەوە، هەر ئێستا قائیمقامێك دامەزرێت کە بۆ کاروباری ناوچەکە سەرکەوتوو بێت و شارەزا بێت، سەعید بەگ کە لە قائیمقامیەتی کۆی سانجەق و ڕواندز بە وەکالەت کاری کردووە، ئەگەر چی هەڵیشنەبژێردراوە بەڵام لە خەسڵەتەکانی بۆ ئەم کارە گونجاوە، پێشنیاری بۆ کراوە بەڵام هێشتا نەڕۆیشتووە، بەڵام ئەگەر هاتوو بە گەورەیی خۆی کارەکەی قەبوڵ کرد بەپەلە کارەکە جێبەجێ بکرێت، ڕاگەیەندراوە فەرمان.<br>٤ کانوونی دووەم ۱۳۱٦<br>حازم والی موسڵ | | |



| 5 سەفەر 1318 | 02354.00138 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٥ سەفەر ١٣١٨
٢١ مایس ١٣١٦
بۆ ویلایەتی موسڵ
قائیمقامی ئاڵای ٤٥ی نیزامیە قاسم بەگ، راگەیەندراوە کە لە قائیمقامیەتی بازیان دامەزراوە، دەرماڵەی سەربازی لەو مووچە زیاترە کە لە مووچەی قائیمقامیەتی قەزای ناوبراو بۆی تەرخانکراوە، بۆیە بە بریارێك مووچەی قائیمقامیەتەکەی وەستێنراوە و دەرماڵەی سەربازی پێ دەدرێت، تۆمار رێکخراوە، لەوێ کارەکە جێبەجێ دەکرێت و لەگەڵ ئەوەش زانیاری مێژووی دەست بەکاربوون و دەست لەکارکێشانەوەی دراوەتە والای سەر عەسکەر بە ووتەی ژمێریاریش بەپەلە راگەیەندراوە.

بۆ لایەنی جەنابی سەر عەسکەر
قائیمقامی ئاڵای ٤٥ی نیزامیە قاسم بەگ لەبەر ئەوەی مووچەی سەربازیەکەی لە مووچەی قائیمقامیەتی قەزای ناوبراو زیاترە، بۆیە مووچەی قائیمقامیەتی وەستێنراوە، بە گوێرەی نیزام تەنیا دەرماڵەی سەربازی پێ دەدرێت، ئەمەش بە ویلایەتی موسڵ راگەیەندراوە، بەپەلەش لە ژمێریاری راگەیەندراوە و ئاماژەی پێکراوە.




| 28 ڕەجەب 1318 | 02430.00010 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٨ ڕەجەب ١٣١٨
٨ تشرینی دووەم ١٣١٦
بۆ ویلایەتی موسڵ
هەر چەندە خۆی بۆ چینی سەربازیی تەرخان کردووە، ئەرکی مولکیەی و سەربازی بەیەکەوە چوونەتە پاڵ یەکتر، بۆ دۆزینەوەی یاسایەك کە لە کامە لایەن مووچەکە بدرێتە فەرمانبەران و لە کامە لایەن ببردرێت، بەڵام لە کامە لایەن دەرماڵەکەی زیاتر بێت، ئەوی پێ بدرێت، هەروەها قائیمقامیەتی سەربازیی مووچەی مانگانەی ١١٢٥ و دەرماڵەی شوێنگرەوەش ٦٢٧ قوروشە بە کۆکراوەیی ١٧٥٢ قوروش دەکات، لەسەر ئەمە بە مووچەی مانگانە ١٥٦٥ قوروش فەرمان دراوە لەسەر دامەزراندنی قائیمقامی ئاڵای ٤٥ی نیزامیە قاسم ئەفەندی لە قائیمقامی قەزای بازیان، بەڵام مووچەکەی لە لایەنی سەربازیی پێ دەدرێت و مووچەی لایەنی مولکیە دەستی بەسەردادەگیرێت، ئەمەش لە ٢٩ مایس ١٣١٦ بۆ ویلایەتی پایەبەرز نووسراوەتەوە، هەروەها ناوبراو دەرماڵەی سەربازیی لە ١٠٦٩ قوروش پێك دێت، بۆیە دەرماڵەی سەربازی لێ ببردرێت و مووچەی مولکیەی پێ بدرێت، ئەگەرچی ئەمجارە داوای کردووە کە دەرماڵەی هەردوو لایەنی پێ بدرێت، بەڵام لە بارەی جێبەجێ کردنی ئەرکەکەی بە گوێرەی فەرمانی پاشای جەنابی پاشا بوێری ناکرێت لە دەرەوەی یاسا بریار مامەڵەکەی بۆ بکرێت و جێبەجێ کردنی جێگەی قەبوڵ نییە، لە بارەی خۆشیەوە لەسەر ووتەی ژمێریاری ڕاگەیەندراوی بەپەلە کراوە.






DH.MKT.02432.00040.001

| DH.MKT. | 02432.00040 | 4 شەعبان 1318 |
|---|---|---|

٤ شەعبان ١٣١٨
١٤ تشرینی دووەم ١٣١٦
لە قەزاکانی کەلعەنبەر و بازیان فەرمانبەرانی مولکیە و دادوەری ئەو خانانەی بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکەکانیان بە کرێیان گرتووە، هەروەها لەبەر ئەوەی گرتووخانە و زیندانخانە نییە، بە گوێرەی پێویست چەند کەسێك نێردراوەتە مەرکەزی لیوا، لە سەرپەرشتیاریەتی دادوەری ویلایەت ئاماژەی پێکراوە، بۆ ئەوەی خزمەتە یاساییەکان بە باشی جێبەجێ بکرێت، لە قەزا ناوبراوەکاندا بۆ فەرمانبەرانی دادوەری فەرمانگەیەك بونیاد بنرێت و کەسانێك دامەزرێن و مامەلە یاساییەکان جێبەجێ بکرێن، بۆ ئەمەش پێویست دەکات گرتووخانە و زیندانخانە بونیاد بنرێت، بۆ تەواو کردنی ئەو کارەش لە نەزارەتی دادوەری جەلیلە لە مێژووی ٣٠ تشرینی یەکەم ١٣١٦ ژمارە ٢١١ نووسراوی نووسراوە وەرگیراوە، داواکراوە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.




| DH.TMIK.M. | 00105.00032 | 2 رەبیعی یەکەم 1319 |
|---|---|---|

فەرمانگەی گشتی ئەرکانی جەنگی
یەکەی چوارەم
وێنەی تەلەگرافنامەی جەنابی وەکیلی موشیری فەریق کازم پاشا لە ۲۹ مایس ۱۳۱۷ هاتووە
هەمەوەندەکانی فرقەی سینە و چەتەکانیان قادر و ساڵح رەیحان و کورەکانی لە لایەنی بازیان مەروماڵاتی شێخ محیەددین ئەفەندی برادەری شێخ حەسەن ئەفەندی لە ساداتەکانن لەگەڵ دانیشتوانی گوندەکانیان بردووە، بە چاودێری کردن بەشێکی گەرێندراوەتەوە، ئەوی تر ماوەتەوە، لە بەرێوەبەرایەتی وەکیل راگەیەندراوە، بۆ گەراندنەوەی کەلوپەل و دەستگیرکردنی تاوانباران ئەفسەر و پۆلیس نێردراوە، بۆ ئەم کارەش بینباشی سلێمان ئەفەندی نووسراوی بۆ قائیمقامیەتی بازیان نووسیوە، لە یوسف پاشا میری لیوا تەلەگرافنامە هاتووە و تێدا راگەیەندراوە هەروەها پاشای ناوبراو تەلەگرافنامەیەکی تر هاتووە، ئەوەی بینباشی و قائیمقامی ناوبراو ئاماژەیان پێکردووە، ئەو مەفرەزە نیزامیەی بۆ ئەم مەبەستە دەرچوونە، لەگەڵ چەتەکانی ناوهاتوو رووبەرووبوونەتەوە و چەکیان بەکارهێناوە، لەم رووبەرووبوونەوە سوپاس بۆ خوا سەربازی شاهانە هیچی بەسەر نەهاتووە، لە چەتەکانی سینە عەبدولقادر لەگەڵ دوو کوڕی و کوڕێکی ساڵح هەروەها دوو پیاو کە تا ئێستا ناویان دیار نییە، لەگەڵ سێ سەر مایین بە فیشەك مردوون، جگە لەمە یەك ئەسپ و یەك مایین دەست بەسەرە، بە سەلامەتی گەیشتوونەتە چەمچەماڵ، زانیاری دراوە، فەرمان.




Y.MTV

217/41

Y.MTV.00217.00041.001

<table>
<tr><th>Y.MTV.</th><th>00217.00041</th><th>5 ڕەبیعی یەکەم 1319</th></tr>
<tr><td colspan="3">

پایەی سەر عەسکەر<br>
قەڵەمی نووسین<br>
تایبەتی<br>
وێنەی ئەو تەلەگرافنامە بە شیفرەیەیە کە لە کەرکووك میری لیوا ئەمین پاشا لە ٦ حوزەیران ١٣١٧ ناردوویەتی لە ساڵی ١٣١٤ کاروانی ئەرزاقی سەربازی و کاروانی بازرگانی سلێمانیە بۆ چەمچەماڵ ڕۆیشتووە، بیرۆکەی پیسی تاڵانکردنیان هەبووە، لە بەرامبەر سەربازی شاهانەش چەکیان بەکارهێناوە، یەك کەس شەهید بووە و دوو کەسیش بریندار بووە، لەگەڵ قوماندانیەتی میری لیوا یوسف پاشا یەك مەفرەزە بە فەرمانی پاشا ئەرکیان پێسپێردراوە تا تەمبێیان بکەن، سێ ساڵ لەمەوبەر بە هەموو شێوەیەك لە دەستگیرکردنیان سەرکەوتن بەدەست نەهاتووە، چەتە عەزیز شوانی ئەمجارە بە نهێنی هاتۆتە کەرکووك، لە دوای لێکۆڵینەوە بە پەلە بە موتەسەرفیەت ڕاگەیەندراوە و مەفرەزەی ژاندارمە ڕێکخراوە، جگە لەوە مەفرەزەیەکی نیزامیەش ڕێکخراوە و خراوەتە پاڵ یەکتر و نێردراون، شوێنەکەیان ئابلۆقە داوە، هەروەك بینراوە بە چەك بەرامبەریان وەستاون و هێرشیان کردۆتە سەریان، بەڵام لە سایەی جەنابی خەلافەتپەناهی بۆ یەك ڕۆژیش بێت ڕووداوی نەشیاو ڕوویندەداوە و ڕێگەیان پێ نەدراوە پێ درێژی بکەن، ناوبراو لەگەڵ خیانەتکارەکانی تر لە هاوەڵانی بە ناوی چەتە عوسمان و سادق و ئەحمەد ئەسعەد دەستگیرکراون و شەش تفەنگیش دەستی بەسەر داگیراوە لەگەڵ زیاتر لە ٤٠٠ فیشەك لەگەڵ ئەوانەش ئەو کاتژمێرە هاورێکانیان کە لەوێ نەبوونە ١٣ سەر ئەسپ و کەلوپەلەکانیان کەوتۆتە دەست و رادەستی حکوومەت کراوە، لەم بارەیەوە هیممەتی موتەسەرفی کەرکووك عوسمان پاشا شایەنی باسکردن و ڕێزلێنانە، لەگەڵ ئەمەش نزا و پارانەوەی دانیشتوان بە گشتی بۆتە هۆی سەرکەوتن.

</td></tr>
</table>

DH.ŞFR. 264/21

DH.ŞFR.00264.00021.001

| DH.ŞFR. | 00264.00021 | 16 جەمادی یەکەم 1319 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

لە ١٦ ئۆغستۆس ١٣١٧ ئەندامەکانی ئەو تابورەی لە چەمچەماڵە لەگەڵ هۆزی هەمەوەند لە نێوانیان رووبەروو بوونەوە روویداوە، بە ئاماژەی موشیرەتی جەلیلە ئەو تابورە لەگەڵ تابورەکەی تر بگۆردرێنەوە، فەرمانیش بۆ ئەم مەبەستە دراوە، هەروەها ئەو کەلوپەلەلانەی کە دزراون بەشێکی گەرێندراوەتەوە، بەشەکەی تری کە ماوە پەلە بکرێت لە وەرگرتنەوەی، هەروەها لە بارەی رووداوەکە لەلایەنی مولکیە و سەربازیدا فەرمانبەر نێردراوە بۆ ئەوەی بە هاوبەشی لێکۆڵینەوە ئەنجام بدەن و ئەنجامەکەی رابگەیەنن، بۆ ئەمەش ئامۆژگاری پێویست لە موتەسەرفیەتی کەرکوك و فرقەی قوماندانیەتی دەرکراوە، هێشتا ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە رانەگەیەندراوە، ئەمجارەش دوای دڵنیابوونەوە ئاساییە ئەنجامەکەی رابگەیەندرێت.

١٨ ئۆغستۆس ١٣١٧

والی موسڵ



| 1319 زیلقەعدە 21 | 00456.00045 | DH.MKT. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی نەزارەتی ناوەخۆ
ژمارە ١٣٦٩
لەلایەنی سەربازی ئەو مووچە و دامەزراندنەی کە رێکخراوە لەگەڵ ئەو مووچەیەی کە لە لایەنی مولکیە وەریناگرێت، قائیمقامی بازیان قاسم بەگ داوای کردووە بگەرێتەوە ئالای، هەر خۆشی مانەوەی ناوبراو لەسەر کارەکەی گونجاو نەبوو، سەرەتا لە ویلایەتی موسڵ ئاماژەی پێکراوە، ناوبراو قاسم بەگ لەگەڵ دوورخستنەوەی بەم دواییە لە ویلایەتی ناوهاتوو تەلەگرافنامە لە مێژووی ٢١ کانوونی یەکەم ١٣١٧ دەرچووە و حەواڵە کراوە، لە قائیمقامیەتی ناوهاتوو ماوەیەکی زۆرە بە وەکالەت بەرێوەدەبردرێت، هەروەها هەمەوەندەکان لە ئەدەنە گەراونەتەوە و لە ناو قەزای ناوهاتوو دەبینرێت، بۆیە بە توندی بە پێویست زانراوە قائیمقامێکی بە رەچەلەك دامەزرێت، بۆیە ئاماژەی پێکراوە کە بە پەلە قائیمقامێك دامەزرێت و بنێردرێت.
لەم حاڵەتەدا دوای ئەوەی ئەو پلەیە کراوەتەوە و داواکراوە کە بۆ قائیمقامیەتی قەزای بازیان لە چینی دووەم لێرە مولازمێك لە دەرچووانی مەکتەب هەڵبژێردرێت، بەڵام دوای پێشنیار کەس نەدۆزراوەتەوە ئارەزووی ئەو کارە بکات، ئەمجارە دوای تاقیکردنەوە لە چینی سێیەم بۆ قائیمقامیەت هەڵبژاردننامەی وەرگرتووە، پەرتو ئەفەندی کە لە بەرێوەبەرایەتی فەرتك بوردراوە، لەسەر دامەزراندنی لە جەنابی نەزارەتپەناهی فەرمان هاتووە بۆ جێبەجێ کردنی کارەکەش لەگەڵ تەلەگرافنامەی ناوهاتوو کاغەزی وەرگێردراوی کەسێتی پێشکەش کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٢١ زیلقەعدە ١٣١٩ و لە ١٦ شوبات ١٣١٧


DH.MKT.00471.00067.002

| DH.MKT. | 00471.00067 | 21 زیلقەعدە 1319 |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ١٥٦
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
بۆ جەنابی ئەفەندم
بـۆ جێبەجـێ کردنـی فەریـزەی حەجـی شـەریفە کاتیبـی نووسراوەکانـی قـەزای بازیـان سـەعدی ئەفەنـدی داواکاری پێشـکەش کـردووە تـا مۆڵەتـی پـێ بدرێـت بچێتـە حیجـاز، بـەڵام بـۆ مۆڵەتـی فەرمانبـەران تـا بچنـە حیجـاز دوای وەرگرتنـی مۆڵـەت دەبـێ خۆیـان لـە کاروکـردەوەی خـراپ بـە دوور بگـرن، هەروەهـا وەرزی حـەج بەسـەرچووە، ڕۆیشـتنی ناوبـراو بـۆ حیجـاز بـۆ موتەسـەرفیەتی سـلێمانی ئامـاژە نووسراوەتـەوە، ئەمجـارە ئـەو نووسراوانـەی کـە وەرگیـراوە، شـتێك دەکرێـت و جێبەجـێ دەکرێـت، ئەمـر و فەرمـان بۆ جەنابی ئەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ٢١ زیلقەعـدە ١٣١٩ و لـە ١٦ شـوبات ١٣١٧.
والی موسڵ


T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
ŞD
995 | 37 | 2

ŞD.00995.00037.002

| 10 جەمادی کۆتایی 1319 | 00995.00037 | ŞD. |
|---|---|---|

لەلایەن وەکیلی قائیمقامی پێشووی قەزای بازیان عەبدولرەحمان بەگ داوای خانەنشینی کردووە، لە ویلایەتی موسڵ نووسراو نێردراوە، خشتەی ماوەی خزمەت، جگە لەوە کاغەزی تر پەیوەست بەم بابەتە لە پەراوێزی ژمێریاری ڕێکخراوە، لە دەستەی گشتی ووردبینی بۆ کراوە.
ناوبراو لە مێژووی ئەرکەکەی بری ئەو مووچەی کە وەریگرتووە و لە مێژووی ٢٢ تشرینی یەکەم ١٣١٥ کە لە ئەرکەکەی جیابۆتەوە و ماوەی خزمەتی بۆتە ٣٣ ساڵ، دوای کارەکەی بە پشت بەستن بە بریارنامەی خانەنشینی ٢٦ ماددەی ٤٢، مووچەی ٦٠٧ی بۆ دابین کراوە، ئەو برە مووچەیە لە سندوقی مووچە بۆی دابینکراوە و جێبەجێ کردنی خانەنشینیەکەی کراوەتە نووسراو.
لە ١٠ جەمادی کۆتایی ١٣١٩ و لە ١١ ئەیلوول ١٣١٧


i.DH 1397/26 /1320.S/27

İ.DH.01397

| | | |
|---|---|---|
| I.DH. | 01397.000026 | 15 زیلحیجه 1319 |

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ١٦٢
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
راگەیەندراوی بەندەیە

لەبەر ئەوەی لەلایەنی سەربازی مووچەکەی وەردەگرێت و وەکو قائیمقام مووچەی قائیمقامیەتی وەرناگرێت، قائیمقامی بازیان قاسم بەگ داوای کردووە بگەڕێتەوە ئاڵای و مانەوەی لەوێ گونجاو نییە، ئەمەش لە ویلایەتی موسڵ راگەیەندراوە، هەروەها لە ویلایەتی ناوهاتوو تەلەگرافنامە بە مێژووی ٢١ کانوونی یەکەم ١٣١٧ هاتووە، هەمەوەندەکان گەراونەتەوە ئەو قەزایە، تا ئەوانەش لەوێ دەمێننەوە، هەر لە ماوەیەکی زۆرەوە زۆر بە توندی نیشان دراوە کە ئەو قائیمقامەی کە قەزای ناوبراو بەڕێوە دەبات، دەبێ قائیمقامێکی رەسەن بێت، بە پشت بەستن بەمە ئەگەرچی ئێستا ئەو قائیمقامەی کە لە چینی دووەم لە قەزای ناوهاتوو دەرچووی مەکتەب و هەڵبژێردراو بوونی هەیە، بەڵام کەسێك نییە ئارەزووی ئەو ئەرکەی هەبێت، ئەمجارە پەرتو ئەفەندی کە لە بەڕێوەبەری فەرنك دەستی لە کارکێشاوەتەوە، دوای تاقیکردنەوە هەڵبژاردننامەی لە قائیمقامیەتی چینی سێیەم وەرگرتووە، بۆیە تەلەگرافنامە هاتووە کە بە تەنسیب لە قەزای ناوهاتوو دامەزرێت، کاغەزی وەرگێراوی پەسەند کراوی هاوپێچ پێشکەش کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

لە ١٥ زیلحیجە ١٣١٩ و لە ١٢ مارت ١٣١٨
نازری کاروباری ناوەخۆ




DH.MKT.02519.00089.001

| DH.MKT. | 02519.00089 | 21 رەبیعی کۆتایی 1319 |
|---|---|---|
| ٢١ رەبیعی کۆتایی ١٣١٩<br>٢٤ تەمموز ١٣١٧<br>بۆ لایەنی جەنابی سەر عەسکەر و ویلایەتی موسڵی پایەبەرز<br>لە قائیمقامیەتی بازیان قائیمقامی نیزامیە قاسم بەگ بەهۆی ڕووداوەکان و گرنگی قەزاکە، لەم قەزایە لە ئالای ٤٥ی نیزامیە قائیمقام حیلمی بەگ دەستپێك بەهۆی خزمەتە باشەکانی کە کردوویەتی، پلەی سەربازی بەرز بۆتەوە، لەگەڵ ئەوەش مووچە و دامەزراندنی لایەنی سەربازی بەو مەرجەی دادەمەزرێت کە مووچەی قائیمقامیەتی قەزای پێ دەدرێت، ئەمەش لە ویلایەتی موسڵ تەلەگرافنامە لە ٢٥ حوزەیران ١٣١٧ دەرچووە و تێدا ئاماژەی پێکراوە، چۆنیەتیشی بۆ لایەنی والای سەر عەسکەر نێردراوە، بە گوێرەی ئەو وەڵامەی لەوێ وەردەگیرێت جێبەجێ دەکرێت. | | |




| 5 شەعبان 1319 | 02555.00044 | **DH.MKT.** |
|---|---|---|

٥ شەعبان ١٣١٩
٣٠ تشرینی یەکەم ١٣١٧
بۆ پایەی وەکالەتی سەدارەتپەناهی جەلیلە

لە لایەنی سەربازی ئەو مووچە و دامەزراندنانەی دابینکراوە، لەگەڵ ئەو برە مووچەیەی کە لە لایەنی مولکیە دەدرێت، جیاوازە بۆیە قاسم بەگ قائیمقامی بازیان داوای کردووە رێگەی پێ بدرێت بگەرێتەوە ئاڵای، بۆ ئەمەش لەشکری شەشەمی هومایۆن ئاگادار کراوەتەوە، جگە لەمەش مانەوەی ناوبراو لەسەر کارەکەی گونجاو نییە، لەگەڵ دوورخستنەوەی لە شوێن ئەو سەعید بەگ کە بە وەکالەت لە قائیمقامەکانی کۆی سانجەق و رواندز دامەزراوە دابنرێت، لە ویلایەتی موسڵ ئاماژەی پێکراوە و کەنارەکانی قەزای مارغلیج فراوانە لەبەر گرنگی شوێنەکەشی پێویستی بە قائیمقامێکی گەنج و چالاك هەیە، قائیمقام ساڵح ئەفەندی بە گواستنەوەی بۆ شوێنێکی تر بۆ ئەوێ کەسێکی گونجاو بنێردرێت، ئەمەش لە ویلایەتی یاینە نووسراو نووسراوەتەوە و نێردراوە. لە شوێن قاسم بەگیش بۆ قائیمقامیەتی قەزای بازیان سەعید بەگ دامەزراندنی گونجاو نییە، بۆیە لە شوێن ئەو لە چینی دووەم هەڵبژێردراو ساڵح ئەفەندی بگوازرێتەوە، بۆ قائیمقامیەتی مارغلیجیش لە هەمان چین هەڵبژێردراو لە دەرچووانی مەکتەبی مولکیەی شاهانە قائیمقامی پێشووی قەرەئاغاجی رۆژئاوا ئەحمەد زوهتی ئەفەندی دابمەزرێت، لەم بارەیەوە لە ویلایەتی یاینە نووسراوەکانی ئەحمەد زوهتی ئەفەندی لەگەڵ کاغەزی وەرگێردراوی کەسێتی پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی هاوکاری سەدارەتپەناهی پێویستە.



ŞD.00218.00024.001

| 1320 10 جەمادی یەکەم | 00218.00024 | ŞD. |
|---|---|---|

نەزارەتی مەعاریفی گشتی
قەڵەمی نووسین
ژمارە
٤٨٩٨٨ گشتی
١٣١ تایبەتی
راگەیەندراوی بەندەتانە
پروپاگەندەی ئەوە کراوە چەکی بەرامبەر قائیمقامی قەزای بازیان، پەرتو ئەفەندی راگرتووە، لە دادگای سەرەتایی دەرسەعادەت دوای لێکۆڵینەوە پێویست کراوە دادگایی بکرێت، بە گوێرەی ئەو بریارنامەیەی کە دراوە، تەنیا یەکێك لە ئەندامەکانی مەعاریف مەحمود زەکی بەگ خراوەتە ژێر دادگا، فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی، بە نووسراو نەزارەتی دادوەری جەلیلە ئاماژەی پێکراوە، بۆ جێبەجێ کردنی فەرمان و راگەیەندراوی لەسەر فەرمانی سەرووی جەنابی وەکالەتپەناهی دەبێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ١٠ جەمادی یەکەم ١٣٢٠ و لە ١ ئۆغستۆس ١٣١٨
نازری مەعاریفی گشتی

DH.ŞFR.00287.00015.001

| DH.ŞFR. | 00287.00015 | 18 ڕەبیعی یەکەم 1320 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

ئەگەر داوا بکرێت دە یەکی (اعشار) قەزای بازیان بە سەربازی شاهانە کۆبکرێتەوە، ئەوا سەرقاڵکردن و کۆکردنەوەی دە یەك (اعشار) بە سەربازی شاهانە کارە گرنگەکانی خۆیان بەلاوە دەنێن، بە گوێرەی نیزام بە موزایدە حەواڵەی ئەو کەسانە بکرێت کە داوای جێبەجێ کردنی کارەکەیان کردووە، بۆ ئەم مەبەستەش بە وەکالەتی موتەسەرفیەتی سلێمانیە ڕاگەیەندراوە، فەرمان.

٢ حوزەیران ١٣١٨

ڕەشید والی موسڵ

DH. MKT 555/12



| DH.MKT. | 00555.00012 | 23 ڕەبیعی کۆتایی 1320 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

لـە ١٦ تەممـوز ١٣١٨ عەبدوڵڵا بەگـی هەمەوەنـد لـە دوای ڕۆیشـتنی بـۆ دەورووبـەری ئەدەنـە، ئەوانـی تر تووشـی ڕووداو بوونـە، داوای گەرانـەوەی زەوی و مولکـی خۆیـان کـردووە، ڕاگەیەنـدراوە و دووبارەیـان کردۆتـەوە کە تووشـی کاری سـەرپێچی هەمەوەنـدەکان بوونـە، ناوبراویـش بـۆ ئـەوەی ئەنجامێـك بـۆ ئـەم حاڵەتـە بدۆزێتـەوە، هاتۆتـە مەرکـەزی ویلایـەت، حەفیـد شـێخ مەعـروف ئەفەنـدی و بـرادەری سـەید مسـتەفا ئەفەنـدی و بابـا ڕەسـول زادە سـەید ئەحمـەد ئەفەنـدی بـۆ ئـەوەی دەسـت لـە زەوی و زار و مولکـی سـورتاش و بازیـان نـەدەن، لـە ئەنجوومەنـی کارگێـری بەڵێننامـەی باوەڕپێکـراوی بـە سـەنەدیان داوە، بـەم شـێوەیە سـاردیەك لـە نێوانیـان زیـاد بـووە، لـە موتەسـەرفیەتی سلێمانیە ڕاگەیەنـدراوە، لـە ١٧ تەممـوز ١٣١٨.

ڕەشید بە ناوی والی موسڵ




| MF.MKT. | 00652.00048 | 1 جەمادی یەکەم 1320 |
|---|---|---|

نەزارەتی دادوەری مەزهەب
بەڕێوەبەرایەتی کاروباری سزا
ژمارە ٣٠
بۆ جەنابی دەوڵەت

بە مەبەستی ترساندن چەکی لە محەمەد پەرتو ئەفەندی قائیمقامی قەزای بازیان هەڵگرتووە، لە دادگای سەرەتایی دەرسەعادەت لەلایەن دادوەری لێکۆڵینەوە بریار نامە دەرچووە تا دادگایی بکرێت، بەڵام لەبەر ئەوەی مەحمود زەکی بەگ ووتوویەتی کە لە ئەندامەکانی مەعاریفە، بۆیە بۆ دادگاییکردنەکەی ئەوا لە مێژووی ١ تەمموز ١٣١٨ نووسراو لە داواکاری گشتی دادگای پێداچوونەوە دەرچووە کە پێویستە فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی دەربچێت، هەروەها لە بریارنامەی ناوهاتوو وێنەی پەسەند کراوی بۆ سەروو نێردراوە، بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١ جەمادی یەکەم ١٣٢٠ و لە ٢٤ تەمموز ١٣١٨.

نازری دادوەری




| BEO. | 001849.138666 | 7 سەفەر 1320 |
|---|---|---|

٧ سەفەر ١٣٢٠
٢ مایس ١٣١٨
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
سەبارەت بە دامەزراندنی پەرتو ئەفەندی بەڕێوەبەری پێشووی ناحیەی فەرتەك لە قائیمقامیەتی قەزای بازیان، نووسراوی مێژووی ١٥ زیلحیجە ١٣١٩ ژمارە ١٦٢ بە بڕیاری قۆمیسیۆنی مولکیەی فەرمانبەران دوای ڕەزامەندی لە مێژووی ٥ سەفەر ١٣٢٠ بە فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی بۆ جێبەجێ کردنی داوای هیممەت کراوە.




| DH.MKT. | 00738.00038 | 12 ڕەبیعی کۆتایی 1321 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی

٣٤٦

پەرتو ئەفەندی قائیمقامی بازیان لە سەرەتای ئەرکەکەیەوە خەریکی تەمبێ کردن و چاکسازیە، جگە لەوە لە توندوتیژی هەمەوەندەکان دڵنیا نییە، لە ناو مەترسیدان، هەروەها لە قەزای ناوبراو لەسەر بەردەوام بوونی ئەرکەکەی جێگای مەترسییە و پارێزراو نییە، هەرخۆشی داوای گۆرینەوەی کردووە، لەبەر ئەوەی قائیمقامیەتی عەقرە کراوەیە بۆیە گواستنەوەی ئەرکەکەی و دامەزراندنی، نووسراو لە ویلایەتی موسڵ لە مێژووی ١ مایس ١٣١٩ ژمارە ٤٢ نێردراوە. بە تێروانین لە وێنەی ڕاگەیەندراوەکە پەرتو ئەفەندی بەردەوام بوونی ئەرکەکەی لە قەزای بازیان باش نابێت، پشت بەستن بە ئاماژەی باسکراو گواستنەوەی بۆ قائیمقامیەتی عەقرە بە فەرمانی جەنابی نەزارەتپەناهی بۆ جێبەجێ کردنی وێنەی پەسەند کراوی نووسراوەکانی باسکراو پێشکەش کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٢ ڕەبیعی کۆتایی ١٣٢١ و ٢٤ حوزەیران ١٣١٩.




٦٩٥

موصل ولایتی داخلنده بازیان قائممقامی برتو افندینک عقره قائممقاملغنه تحویل مأموریتی اجرا اولنمسی [illegible] و ایکنجی صنفدن اولوب
بازیان قائممقاملغنه ده صنف مذبوره منتخب ومکتب ملکیهٔ شاهانه دن مأذون اولانلردن رغبت ایدن بولنمامسی واوچنجی صنفه منتخب
ملازمیندن اولوب انتخاب جریده سی کاغدی وترجمهٔ حالی ورقهسی لفاً تقدیم قلنان قوچحصار قائممقامی اسبق علی فرحی بکک تعیینی نزد سامی
جناب نظارتپناهیلرنده رهین تصویب بیورلدیغی تقدیرده ایفای مقتضاسنک بابنده امر وفرمان حضرت من له الامرکدر

٦ شعبان ١٣٢١ و ١٤ تشرین اول ١٣١٩



DH.MKT.00789.00068.001

| 1321 شەعبان 6 | 00789.00068 | DH.MKT. |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>..........<br>٦٩٥<br>لە ناو ویلایەتی موسڵ پەرتو ئەفەندی قائیمقامی بازیان ئەرکەکەی بۆ قائیمقامیەتی عەقرە گۆڕاوە، فەرمان دراوە بۆ جێبەجێ کردنی و لە چینی دووەمە، بۆ قائیمقامیەتی بازیانیش لە هەمان چین هەڵبژێردراوە، هەروەها لە مەکتەبی مولکیەی شاهانە دەرچووە، هیواخوازن بدۆزرێتەوە، لە مولازمی چینی سێیەم هەڵبژێردراوە، کاتی هەڵبژاردنی هاتووە و کاغەزی زانیاری وەرگێراوی پێشکەش کراوە، قائیمقامی کۆچحیساری پێشوو فەهمی بەگ دادەمەزرێت، لە کاتی دەنگدانی جەنابی نەزارەتپەناهی جێبەجێ دەکرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>٦ شەعبان ١٣٢١ و ١٤ تشرینی یەکەم ١٣١٩ | | |




<table dir="rtl">
<tr><th>DH.MKT.</th><th>00810.00056</th><th>15 شەوال 1321</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>...........<br>...........<br>ژمارە ٨٥٢<br>لە ناو ویلایەتی موسڵ بریار دراوە لەسەر جێبەجێ کردنی حەواڵە کردنی ئەرکەکەی پەرتو ئەفەندی قائیمقامی قەزای بازیان، هەروەها کەسێك نەدۆزراوەتەوە لە چینی دووەم بێت و ئارەزووی ئەو کارە بکات و بیەوێت لە قائیمقامیەتی قەزای ناوهاتوو دابمەزرێت، بۆیە لە چینی سێیەم کە ئارەزووی ئەو کارەی نەبووە، بەڵام کاتی هەڵبژاردنی هاتووە هەروەها کاغەزی وەرگێردراوی زانیاری کەسێتی پەسەند کراوە هاوپێچ پێشکەش کراوە، مستەفا پاشا کە لە قائیمقامیەتی میخالیچجیك بەخشراوە، لەسەر دامەزراندنی لەلایەن جەنابی سەدارەتپەناهی فەرمان دراوە، بۆ جێبەجێ کردنی مامەڵەکەی ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>لە ١٥ شەوال ١٣٢١ و لە ٢٢ کانوونی یەکەم ١٣١٩</td></tr>
</table>



| I.DH. | 01413.000046 | 26 جەمادی یەکەم 1321 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
١٥٣٠
بۆ جەنابی ئەفەندم
لە ناو ویلایەتی موسڵ قەزای عەقرە قائیمقامیەتەکەی بە کراوەیی ماوەتەوە، لە هەمان کاتدا قائیمقامی قەزای بازیان پەرتو ئەفەندی داوای کردووە بۆ شوێنی ناوهاتوو بگوازرێتەوە، لە بارەی دامەزراندن و گواستنەوەی ناوبراو بریارنامە لە قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە رێکخراوە، لەگەڵ نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە و کاغەزی وەرگێردراوی کەسێتی راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، بە هەر شێوەیەك بێت فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو ژمارەی لەسەر تۆمار کرا.
لە ٢٦ جەمادی یەکەم ١٣٢١ و لە ٧ ئۆغستۆس ١٣١٩
سەدری ئەعزەم


i.DH. 1419/29 /1321. Z/29

İ.DH.01419

| I.DH. | 01419.000029 | 27 شەوال 1321 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ٥٦٢٩
جەنابی سەدارەتپەناهی پایەبەرز
ڕاگەیەندراوی بەندەیە

لە ناو ویلایەتی موسڵ لەبەر ئەوەی پەرتو ئەفەندی قائیمقامی قەزای بازیان بۆ قائیمقامیەتی عەقرە دەگوازرێتەوە، ناوبراویش لە چینی دووەمە، هیچ کەسێکیش ئارەزووی نییە لە هەمان چین لە قەزای بازیان دابمەزرێت، بۆیە لە قەزای میخالیچچیك قائیمقام مستەفا پاشا لە چینی سێیەمە و لە کارەکەی بوردراوە، لە قەزای ناوبراو دابمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستەش کاغەزی وەرگێردراوی پەسەند کراو پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی بیرورا بۆ وەکالەتپەناهیە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٧ شەوال ١٣٢١ و لە ٣ کانوونی دووەم ١٣١٩.

نازری کاروباری ناوەخۆ




| BEO. | 002082.156100 | 5 رەبیعی یەکەم 1321 |
|---|---|---|

فەرمانگەی ئەرکانی گشتی جەنگی

یەکەی چوارەم

وێنەی تەلەگرافنامەی بە شیفرەی موشیری لەشکری همایۆنی شەشەم لە بەغداد جەنابی فەیز پاشا لە مێژووی ١٣ مایس ١٣١٩ هاتووە

لە ١٠ مایس ١٣١٩ هەندێك لە فرقەکانی هۆزی جاف لە نێوان خۆیان رووبەرووبوونەوە روویداوە، لەبەر ئەوە سەربازی شاهانە ئاگادار کراوەتەوە، لە ویلایەتی موسڵ تەلەگرافنامە لە ٢٥ نیسان ١٣١٩ هاتووە، بە گوێرەی ئەو ئاماژەی کە پێشووتر رۆیشتووە و وەڵامەکەی هاتۆتەوە، ئاگاداری بۆ قوماندانیەتی فرقەی ١٢ رۆیشتووە و بە هاوەڵی کەریم بەگی قائیمقام لەگەڵ فرقەیەکی سوارەی ئێستر بۆ شوێنی مەبەست رۆیشتوون، لە زەوی و زاری همایۆنی سلێمانی هەژماری ئاژەڵ مەفرەزەیەك لە ٣٠ سوارەی ئێستر هەروەها لە چەمچەماڵیش ١٠٠ پیادە فەرمان دراوە لەگەڵ ناوبراو یەکبگرن، هەروەها راگەیەندراوە بۆ ئەوەی گرنگی بە روونەدانی رووداوەکان بگرن، لەگەڵ موتەسەرفیەتی سلێمانیە نووسراو بۆ سەرۆکی هۆزی جاف مەحمود پاشا نووسراوە، لە کۆتاییدا لە قوماندانی ناوبراو تەلەگرافنامە لە مێژووی ١٠ مایس ١٣١٩ هاتووە، کە نیشانی داوە ناوبراو کەریم بەگ بە جێبەجێ کردنی ئەرکەکەی گەڕاوەتەوە چەمچەماڵ، فەرمان.




| BEO. | 002164.162265 | 17 جەمادی کۆتایی 1321 |
|---|---|---|

١٧ جەمادی کۆتایی ١٣٢١
٢٧ ئۆغستۆس ١٣١٩
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
قائیمقامی قەزای بازیان پەرتو ئەفەندی بۆ قائیمقامیەتی قەزای عەقرە بگوازرێتەوە و دابمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە لەسەر نووسراوی دەوڵەت لە ٢٠ رەبیعی کۆتایی ١٣٢١ ژمارە ٢٣٩٥ بە بریاری قۆمیسیۆنی مولکیەی فەرمانبەران مۆڵەتدراوە لە مێژووی ١٥ جەمادی کۆتایی ١٣٢١ فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی فەرموویەتی، هیممەت بکرێت بۆ جێبەجێ کردنی.



| 1321 شەعبان 13 | 002222.166644 | BEO. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ٤٥٨٠
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
ڕاگەیەندراوی بەندەتانە

لە ناو ویلایەتی موسڵ قائیمقامی قەزای بازیان پەرتو ئەفەندی ئەرکەکەی حەواڵەی قائیمقامیەتی قەزای عەقرە بووە، هەروەها بۆ قائیمقامیەتی قەزای ناوهاتوو لە چینی دووەم و لە دەرچووانی مەکتەبی مولکیەی شاهانە هیچ کەسێك نەدۆزراوەتەوە ئارەزووی هەبێت دابمەزرێت، بۆیە لە چینی سێیەم هەڵبژێردراو، نۆرەی هاتووە و وەرگێردراوی کاغەزی باری کەسێتی هاوپێچ پێشکەش کراوە، ئەویش قائیمقامی پێشووی قەزای قۆچحیسار عەلی فەهمی بەگە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش پێویستی بە فەرمانی جەنابی سەدارەتپەناهیە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمانی دەردەکات.

لە ١٣ شەعبان ١٣٢١ و لە ٢١ تشرینی یەکەم ١٣١٩
نازری کاروباری ناوەخۆ




| | | |
|---|---|---|
| BEO. | 002293.171932 | 27 زیلحیجه 1321 |

٢٧ زیلحیجه ١٣٢١
٢ مارت ١٣٢٠
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

بـۆ قائیمقامیەتـی قـەزای بازیـان لـە قائیمقامیەتـی قـەزای میخالیچجـك مسـتەفا پاشـا کـە دەسـتی لـە کار کێشـاوەتەوە دامەزرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە نـووسراوی دەوڵـەت لـە مێـژووی ٢٧ شـەوال ١٣٢١ ژمـارە ٥٦٢٩، بـە بریـاری قۆمیسـیۆنی مولکیـەی فەرمانبـەران بـە ڕەزامەنـدی مێـژووی ٢٦ زیلحیجـە ١٣٢١ فەرمانـی پاشـای جەنابـی خەلافەتپەناهـی فەرموویەتـی، هەروەهـا ناوبـراو لـە دوا ئەرکـی بـۆ دادگا بانـگ کـراوە، بـەڵام بەهـۆی نادروسـتی بابەتەکـە، لـە ئەنجوومەنـی کارگێـری ویلایەتـی ئەنقـەرە لەلایـەن دادوەری لێکۆڵینـەوە ڕێگـە نـەدراوە دادگایـی بکرێـت، هەروەهـا لـە شـورای دەوڵـەت بریـار دراوە ئەرکـی پـێ بدرێـت، لـە کاتـی ووردبینـی دەرکەوتووە، لـە بارەی دووبارەبوونـەوەی ئـەو سـکاڵایانە ڕێگـە نادرێـت بـە هیـچ شـێوەیەك ئەرکـی پـێ بدرێتـەوە، بـۆ ئـەوەی بـە خۆشـی لـەم بارودۆخـە تێبـگات نـووسراوی قۆمیسـیۆن نێـردراوە، هیممـەت بکرێـت بـۆ جێبەجـێ کردنـی.



| BEO. | 004173.312973 | 7 جەمادی کۆتایی 1331 |
|---|---|---|

نەزارەتی دارایی
بەڕێوەبەرایەتی خاوەندارێتی میری
قەڵەمی دووەم
١٠٦٥ گشتی
٢١ تایبەتی
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
پۆختە: سەرۆکی کارگێری مولکیەی بانە، حەمە خان لە ناو قەزای بازیان لە زەوی و زاری میری نیشتەجێ دەکرێت.

ڕاگەیەندراوی بەندەمانە
مێژووی ٢١ نیسان ١٣٢٩ ژمارە ٤٠٤٤ وەڵامی داواکاری نووسراوی سەدری ئەعزەمی جەنابی سەدارەتپەناهیە، لەلایەن حکوومەتی عوسمانیە روون بۆتەوە، لەلایەن فەرمانبەرانی ئێرانی زوڵمیان لێکراوە، هانای بۆ دەوڵەتی عوسمانی بردووە، لە ناحیەکانی رۆژهەڵات و سەرۆکە بە تواناکان دڵسۆزی خۆی و خزمەتکردنی بۆ دەوڵەتی عوسمانی راگەیاندووە، فەرمانبەری کارگێری مولکیەی پێشوو حەمە خان لەگەڵ هەموو هاوەڵانی بەیەکەوە لە ناو قەزای بازیان ئەوەی بەتاڵە و بەشێك وێران بووە و هاتۆتە حاڵەتێکی لە کارکەوتوو، زەوی و زاری سوراوە و گوندە جۆڵەکان نیشتەجێ دەکرێن و رەزامەندی دراوە، یەکەم جار لەسەر نووسراو لە نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلەی نێردراو، لە ناو قەزای ناوهاتوو حەمە خان و هاوەڵانی نیشتەجێ دەکرێن، لەلایەن کەسانی تر بە هەر شێوەیەك چی دەبێت و نابێت چەند زەوی میری جۆڵ و وێران هەیە، هەروەها زەوی و زاری ناوهاتوو ئەگەر بکرێت چاکسازی تێدا بکرێت و ئاوەدان بکرێتەوە، بۆ ئەمەش پرس بە دەفتەرداری ویلایەتی موسڵ کراوە، بە گوێرەی ئەو وەڵامەی کە هاتووە، جێبەجێ کردنی ئاساییە مامەڵەکە لە خەزینە ئەنجام بدرێت، راگەیەندراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٧ جەمادی کۆتایی ١٣٣١ و ١ مایس ١٣٢٩.

بە ناوی نازری دارایی

DH.ŞFR.00334.00029.001

| | | |
|---|---|---|
| 26 رەجەب 1322 | 00334.00029 | DH.ŞFR. |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لەگـەڵ داواکاری ١٠ تەممـوزی ١٣٢٠ ژمـارە ٦١ راگەیەنـدراوە، لەبـەر گرنگـی قـەزای هەولێـر قائیمقامـی قـەزای بازیـان مسـتەفا پاشـا هەرچـی زووە بۆ قـەزای ناوبـراو بگوازرێتـەوە و دابمەزرێـت، فەرمانی جەنابـی نەزارەتیپەناهیە.
لە ٢٣ ئەیلوول ١٣٢٠
نوری والی موسڵ



DH.MKT.00848.00069.001

<table>
<tr><th>DH.MKT.</th><th>00848.00069</th><th>16 موحەررەم 1322</th></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی موسڵ<br>قەڵەمی نووسین<br>ژمارە ١٤<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>بۆ جەنابی دەوڵەت<br>حەمە ئاغای کۆی سانجەق لەگەڵ هۆزی شێخ بزێنی ماوەی چەند ساڵێکە ناکۆکی و دوژمنایەتی نێوانیان بەردەوامە، بۆ نەهێشتنی ئەو دوژمنایەتیە و چاك کردنی نێوانیان هەروەها لەبەر ئەوەی رازونیازی لەسەر ئەم کارە هەیە، لە فەرمانگەی کاروباری قەزا هەردوو وەکیلی قائیمقامی کۆی سانجەق و بازیان عەبدوڵڵا موخڵیس بەگ و عەبدولرەحمان بەگ هیممەتیان بیـنراوە، هەروەها هەردوو ناوبراوان هەر لە کۆنەوە دڵسۆز بوونە بۆیە شایەنی رێزگرتنن، ئەم جۆرە کەسانە شایەنی ئەوەن لەلایەن پاشاوە پاداشت بکرێن، ناوبراو عەبدوڵڵا موخڵیس بەگ خاوەنی پلەی دووەم و عەبدولرەحمان بەگ خاوەنی پلەی چوارەمە، بە میهرەبانیەوە هەر یەکە پلەیەك بەرز بکرێنەوە، یاخود بفەرموون بە نیشان رێزیان لێ بگیرێت، ئەمەش بە هاوکاری نەزارەتپەناهی بێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٦ موحەررەم ١٣٢٢ و لە ٢٠ مارت ١٣٢٠.<br>والی موسڵ</td></tr>
</table>



| | | |
|---|---|---|
| 29 ڕەبیعی کۆتایی 1322 | 00859.00088 | DH.MKT. |

٢٩ ڕەبیعی کۆتایی ١٣٢٢
٣٠ حوزەیران ١٣٢٠
بۆ ویلایەتی موسڵ
نووسراوی مێژووی ١٥ مایس ١٣٢٠ ژمارە ٣٨ وەڵامی سەعادەتە، بۆ کیتابەتی ناسنامەی قەزای بازیان دەرویش ئەفەندی دامەزراوە، لە مێژووی دەست بە کار بوونی ناوبراو بە گوێرەی تۆمار مانگانە ١٢٥ قوروش مووچەی بۆ براوەتەوە، لەوێ لە کاتی جێبەجێ کردنی ئەرکەکەی بە پشت بەستن بە بریاری نیزامیە فەرمانی سوێند خواردن و مێژووی دەستبەکاربوونی لەگەڵ مێژوو و هۆکاری دابرانی عەبدولقادر ئەفەندی و کاغەزی وەرگێردراوی زانیاری بە مەبەستی تۆمارکردن بۆ یەکەی تۆماری نەزارەت دەنێردرێت، بە ووتەی ژمێریاری بۆ ڕاگەیاندنی بە پەلە دەست بە کارەکە بکرێت.


T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA)

٩١٢

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
929 | 39 | 1

DH.MKT.00929.00039.001

| DH.MKT. | 00929.00039 | 22 زیلقەعدە 1322 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی نەزارەتی ناوەخۆ
قەڵەمی فەرمانبەر
٩١٢

عەلی غالب ئەفەندی لە قائیمقامیەتی قەزای رواندز بۆ قائیمقامیەتی قەزای هەولێر ئەرکەکەی گوازتۆتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی لەگەڵ کەشوهەوا و نەریتی ئەوێ نەگونجاوە، نامەی لێخۆشبوون لە کارەکەی پێشکەش کردووە، هەروەها بۆ قائیمقامیەتی قەزای هەولێر کەسێکی لێهاتوو و بە توانا بۆ شوێنێکی ئاوا گرنگ قائیمقامی بازیان مستەفا پاشا بە گونجاو بینراوە، بۆ گواستنەوە و دامەزراندنی لە ویلایەتی موسڵ نووسراوی ١٠ تەممووز ١٣٢٠ ژمارە ٦٠ هاتووە و لە ٢٣ ئەیلوول هەمان ساڵ بە تەلەگرافنامە دووپاتکراوەتەوە.

لە کاتی ووردبینی قەزای هەولێر ناوبراو لە چینی دووەمە هەروەها مستەفا پاشا لە هەڵبژێردراوەکانە، ئەمەش بە تۆمار دەرکەوتووە. بە پشت بەستن بە ئاماژەی ویلایەت بۆ گواستنەوەی ئەرکەکەی لەلایەن جەنابی نەزارەتپەناهیەوە دەرچووە، بۆ جێبەجێ کردنی نووسراو و تەلەگرافنامەی ناوهاتوو هەروەها نامەی لێخۆشبوون وێنەیەکی پەسەند کراوی بە هاوپێچ پێشکەش کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٢ زیلقەعدە ١٣٢٢ و ١٥ کانوونی دووەم ١٣٢٠.



DH.MKT.02603.00015.001

| | | |
|---|---|---|
| 4 موحەڕڕەم 1322 | 02603.00015 | DH.MKT. |
| بابی عالی<br>فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>بۆ قائیمقامیەتی بازیان لە قائیمقامیەتی میخالیچچجك مستەفا پاشا کە دەستی لە کارکێشاوەتەوە، لە مێژووی ٢٦ زیلحیجە ١٣٢١ دامەزراوە و سوێندی خواردووە، لە ٨ مارت ١٣٢٠.<br>نازری کاروباری ناوەخۆ | | |


Y.MTV 274/54

2

Y.MTV.00274.00054.002

| Y.MTV. | 00274.00054 | 11 رەبیعی یەکەم 1323 |
|---|---|---|

پایەی سەر عەسکەر
قەڵەمی نووسین
تایبەتی
لە قوماندانیەتی لەشکری شەشەمی هومایۆن وێنەی شیفرەی تەلەگرافنامەی ٣٠ نیسان ١٣٢١
تۆفیق بەگ میری ئاڵای بازیان لە قوماندانیەتی فرقەی ١٢ سێ پارچە تەلەگرافنامە سەبارەت بە ئاژەڵەکانی مەفرەزەی چاودێری بە تەواوەتی ماوەتەوە، مەفرەزەی ناوهاتووش لەگەڵ چەتەکانی سەفەروند بۆ رووبەرووبوونەوە گیراون، بە پێویستێکی بەپەلە زانراوە کە مەفرەزەی ئێستر سوارەش بروات، جگە لەمە لە کاتی رووبەرووبوونەوەی چەتەی سەفەروند چەند ئاژەڵێك دەست کەوتوون، لە دوای ئەوە لەگەڵ ٥٦ ئەسپی سەفەروندی ناوهاتوو رووبەروو بوونەتەوە، لە شەڕێکدا دوو مایین مردووە و لە چەتەکان چەند برینداریێك هەبووە، لە مەفرەزەکەش یەك ئێستر بریندار بووە کە مەترسی لەسەر نییە، بوشاندیغی و جەباری و تاڵەبانی چوونەتە لای شێخ حامد لە چاودێری کردنی ئەو چەتانەی کە جێگیر بوونە، بۆ ئەمەش مەفرەزە دەستی بە جولە کردووە، بۆیە پێویستە هێزەکە زیاد بکرێت و بۆ مەفرەزەکە برێکی زۆر............. هەروەها سەبارەت بە ناردنی جبەخانە، لە هاوپێچ نامەکانی قوماندانی موشیری ناوهاتوو هەژمار کردنی مەروماڵاتەکان هێشتا لە ناوچەکان تەواو نەبووە، جێبەجێ کردنی داهاتەکانی بۆ تابوری پیادەی ناوچەکە بەجێ هێڵدراوە، ئەو مەفرەزەیەی ئێستر سوارانەی کە لە کۆی سانجەق و توزخورماتو بوونیان هەیە، فەرمان دراوە کە بۆ ناوبراو بنێردرێت، هەروەها چوار سندوق جبەخانە و برێکی تەواو بۆ مەفرەزەکە بنێردرێت، بۆ ئەمەش تابوری یەکەمی ئاڵای ٤٥ و ئاڵای ٤٦ ئەوەی رێکخراوە مەفرەزەیەکی ٦٠ پیادەیی دەنێردرێت، هەروەها بە گوێرەی ئاماژەی رووسەکان ئەو هەمەوەندانەی هێرشیان کردۆتە سەر بازیان دەست کراوە بە چاودێری کردنیان، ئەو جموجۆڵانەش بە ویلایەتی موسڵ و حکوومەتی خۆچێی راگەیەندراوە، بە چاودێری کردنی هێڵی جموجۆڵ لەگەڵ جێبەجێ کردنی کارەکە بە هەموو چاودێری کردنەکانەوە کارەکە کۆتایی پێ بێت، تەنیا لە ماددەی کوشتن ئەوانەی دەستیان تێدا هەیە، لێخۆشبونیان نییە، بۆ دەستگیر کردنیان هیممەت بکرێت، بۆ ئەمەش فەرمان بە تۆفیق بەگ میری ئاڵای دراوە، لە وەڵامی ئەمەش زانیاری یەك مانگ راگەیەندراوە.




تلغراف نامه‌سی

DH.ŞFR 342/73

DH.ŞFR.00342.00073.001

| 1323 ڕەبیعی کۆتایی 2 | 00342.00073 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
کانیکۆهلی سەید نوری لەگەڵ کوڕی هەمەوەند لە فرقەی سەفەرەند چەفاکەش خضر ئەفەندی لە نێوان خزم و کەسەکان چوار ڕۆژ پەلاماری یەکتریان داوە، لەم ڕووبەڕووبوونەوە سەید نوری کوژراوە، چەند کەسێکی تریش کوژراو و برینداربووە، لە ئەنجامی ئەو ڕووداوەی لە نێوان ساداتی سلێمانیە ڕوویداوە، بە زانیاری و ڕاگەیەندراوەکانی هیجان ئێستا ئارامی گەراوەتەوە، بەڵام بۆ لێکۆڵینەوە یاریدەدەری داواکاری گشتی لەگەڵ مەفرەزەی ئێستر سوار بۆ شوێنی ڕووداوەکە ڕۆیشتوون، بۆ ڕێگەگرتن لەم ڕووداوانە و فراوان نەبوونی، جێبەجێ کردنی دراوەتە قائیمقامی بە وەکالەت، بە موتەسەرفیەتی سلێمانیەش ڕاگەیەندراوە، ئەگەرچی بە پەلە ڕاگەیەندراو دراوەتە قوماندانیەتی ناوهاتوو و موتەسەرف دەبێ بەرپرسێکی لێهاتوو دابنرێت تا ڕووداوەکانی نێوان هۆزەکان نەهێڵدرێت، بۆ قەزای بازیانیش لە دەرەوەی قەزاکە لە ڕووی کارگێڕیەوە سەرکەوتوو نەبوونە، بۆ دامەزراندنی قائیمقامێك لە داواکاری مێژووی ٩ کانوونی دووەم ١٣٢٠ ژمارە ١٢٢ و تەلەگرافنامەی ١٣ شوبات ١٣٢٠ ڕاگەیەندراوە ڕەشید بەگ هەرچی زووە بە پەسەند کردنی ئەرکەکەی بچێتە قەزا، فەرمان.
٢٤ مایس ١٣٢١
نوری والی موسڵ


DH.ŞFR.00342.00087.001

| DH.ŞFR. | 00342.00087 | 3 سەفەر 1323 |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

مێـژووی ٢٤ مـارت ١٣٢١ هاوپێچـی تەلەگرافنامـەی بەندەمانـە، گوندنشـین کانـی کـوە، سـەید نـوری لەگـەڵ هەمەوەنـدەکان تووشـی رووبەرووبوونـەوە بـووە، لـە ئەنجامـدا کـوژراوە، بەمـەش غیرەتـی شـێخەکانی سـلێمانیە کـە خزمـی ئەوانـن جولانـدووە، دیسـان وەکـو یەکـەم جـار بـۆ هەڵگیرسـاندنی شـۆرش پۆلیسـەکانی ناوەخـۆ هـان دەدەن، بـەردەوام سـکاڵاکانیان بـە تەلەگرافنامـە دێـت، بـۆ دەسـتگیرکردنی ئەوانـەی بوێـری ئەوەیـان کـردووە شـەڕ بکـەن، لـە سـلێمانیە ٤٥ کـەس لـە هێـزی سـوارە بـۆ ناوچەکـە دەروات، بـەڵام بەهـۆی تـەواو نەبوونیـان لـە فرقـەش داوای مەفـرەزە کـراوە، بـەڵام بـە گشـتی هێـزەکان لـە مامەڵـەی هەژمارکردنـی مەروماڵاتـەکان پەرشـوبڵاو دەبـن و لـە کۆکردنـەوە و هێنانـی ناکرێـت و مامەڵـەی هەژمارکردنەکـە دوادەکەوێـت، بـەم شـێوەیە وەڵامیـش نادرێتـەوە، سـەید نـوری کـوژراو، هەمیشـە لەگـەڵ کۆمەڵـەی زۆری هەمەوەنـدەکان دەگاتـە ئێـران، هەرچـی سـەبارەت بـە توندرەوەکان لـە شـێخەکانی سلێمانیە تەلەگرافنامـە وەرگیـراوە، ئـەو هەمەوەندانـە پێویسـتیان بـە تەمبـێ کردنـە، بـۆ دەسـتگیرکردنی ئەوانـە ئـاگاداری پێویسـت نێردراوەتـە موتەسـەرفیەتی سـلێمانی، کە قـەزای بازیان کە هەمیشـە شـوێنی خۆحەشـاردانی هەمەوەندەکانـە، بـۆ ڕێکخسـتنی کارگێـری ناوچەکـە قائیمقامێکـی لێهاتـوو پێویسـتە، تـکا دەکرێـت بـۆ جێبەجـێ کردنـی.

٢٧ مارت ١٣٢١

نوری والی موسڵ



| 17 سەفەر 1323 | 00948.00070 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٧ سەفەر ١٣٢٣
٩ نیسان ١٣٢١
بۆ ویلایەتی موسڵ
وەڵامی نووسراوی مێژووی ١٢ شوبات ١٣٢٠ ژمارە ١٣٠ لە قەزای بازیان بۆ فەرمانبەری ناسنامە، عارف بەگ بە تەنسیب دامەزراوە، لە مێژووی دەست بە کاربوونی لە ئەرکەکەی لە مێژووی ١٣٢٠ ئۆغستۆس ٢٣، ناوبراو مانگانە ٢٥٠ قوروش مووچەی بۆ براوەتەوە، بە گوێرەی بریاری نیزامی، مامەڵەکەی جێبەجێ دەکرێت، بە مەبەستی تۆمارکردنی کاغەزی وەرگیراوی زانیاری بۆ یەکەی تۆماری ناسنامە نێردراوە، بە ووتەی ژمێریاری پەلە کراوە لە راگەیاندنی.



| DH.MKT. | 00957.00048 | 12 جەمادی یەکەم 1323 |
|---|---|---|

١٢ جەمادی یەکەم ١٣٢٣
٢ تەمموز ١٣٢١
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
بەهۆی پێویستی خۆچێی لە قەزای بازیان قائیمقامیەتەکەی بە وەکالەت بە ڕەزامەندی لەشکری هومایۆن، میری ئالای تۆفیق بەگ دامەزراوە، خەرجیەکەی سێیەکی مووچەی وەکالەتی پێ دەدرێت، لە ویلایەتی موسڵ تەلەگرافنامە دەرچووە، ئەوانەی کە بە وەکالەت ئەرکەکەیان جێبەجێ دەکەن، لە ماوەی وەکالەتەکەیان لە مووچەی کۆنی ئەرکەکەیان تەنیا مووچەی ئەو ئەرکەی کە بەوەکالەت بەرێوەی دەبەن بۆیان دابین دەکرێت و پێیان دەدرێت، هەروەها ئەو کەسەی بەوەکالەت دادەمەزرێت بە گوێرەی تایبەتمەندەکانی ئەگەر پێویست بکات شتی زیاتری پێ دەدرێت، ئەمەش بە ڕەزامەندی وەرگرتن، لە مووچەی ڕاستەقینەی خۆی بری چوار یەك و سێ یەکی ئاقچەی پێ دەدرێت، ئەوەی لە بریارنامەی خەرجی ڕێگا ماددەی هەشتەم هەیە، هەروەها بە تێروانین لە وێنەیەکی ئاماژەی ویلایەت بە ووتەی ژمێریاری چۆنیەتی مۆڵەتەکەی قسەی لەسەر کراوە.




| 4 ڕەبیعی یەکەم 1323 | 00959.00052 | DH.MKT. |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی نەزارەتی ناوەخۆ
١٤٩
قـەزای بازیـان سـەر بـە سـانجەقی سـلێمانیە لەبـەر گرنگـی شـوێنەکەی سـەرەتا بابا ڕەسـول زادە سـەید ئەحمـەد ئەفەنـدی بـە وەکالـەت لـە قائیمقامیەتەکـەی بـووە، زۆر بـە جوانـی کارەکـەی ئەنجـام داوە و لـە ڕووی کارگێریـەوە کارەکانـی بـە ڕێکوپێکـی بەڕێوەبـردووە، بۆیـە لە بنەڕەتـدا بە فەرمانـی پاشـای جەنابی خەلافەتپەناهـی قائیمقامێك دابمەزرێـت، لـە شـوێن خـۆی ئاماژە نێـردراوە بـۆ دامەزراندنـی ناوبـراو، بـۆ جێبەجـێ کردنـی کارەکـەش نـووسراوی سـەدری ئەعـزەم لـە ٢٢ نیسـان ١٣٢١ ژمـارە ٦٠٥ دەرچـووە.
لـە کاتـی پێداچوونـەوە بـۆ قائیمقامیەتـی قـەزای بازیـان لـە بنەڕەتـدا کراوەیـە، پێشـەکی بـۆ دامەزراندنـی محەمەد ڕەشـید بـەگ خاوەنـی دەسـەڵات بـۆ قائیمقامیەتـی ناوهاتـوو لـە ویلایەتـی موسـڵ ئامـاژەی پێکـراوە، ئەگەرچـی لە لایەنـی جەنابـی سـەدارەتپەناهی نـووسراو نووسراوەتـەوە، بـەڵام ناوبراو لە ئەرکـی قائیمقامیەتدا خزمەتی پێشـووی نەبـووە، لەسـەر ئامـاژەی دیاریکراودا ناچێتـە شـوێنی ناوهاتـوو، ئەمـەش لـە قۆمیسـیۆنی مولکیـەی فەرمانبـەران بریارنامـە ڕێکخـراوە و پێشـکەش کـراوە، لـە تۆمـار و لێکۆڵینـەوەدا دەرکەوتـووە، هەروەهـا ناوبـراو سـەید ئەحمـەد ئەفەنـدی لـە قائیمقامیەتێکـدا بـەکار هێنانـی بـە فەرمانـی پاشـای ملوکانـە باسـکراوە، پشـت بەسـتن بـە ئەمـە بـۆ قـەزای بازیـان سـەید ئەحمـەد ئەفەنـدی بـە فەرمانی جەنابـی نەزارەتپەناهـی ئاماژەی پێکـراوە، لە جێبەجـێ کردنی ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ٤ ڕەبیعـی یەکـەم ١٣٢٣ و لـە ٢٥ نیسـان ١٣٢١.



| 12 رەجەب 1323 | 01005.00030 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٢ رەجەب ١٣٢٣
٣٠ ئۆغستۆس ١٣٢١
بۆ ویلایەتی موسڵ
دەرویش ئەفەندی کاتیبی ناسنامە لە قەزای بازیان کاغەزی وەرگێردراوی تۆماری ناسنامەی، بۆ تەواو کردنی مامەڵەکەی بە ووتەی یەکەی تۆماری ناسنامە مێژووەکەی راگەیەندراوە.


ŞD.01033.00079.002

| 22 موحەررەم 1323 | 01033.00079 | ŞD. |
|---|---|---|

نەزارەتی سندوقی خانەنشینی مولکیە و دوورخراوان
قەڵەمی نووسین
ژمارە ٤٤٣٣
فەرمانبەری ناسنامەی قەزای بازیان عارف ئەفەندی مردووە، خێزانەکانی خەدیجە و گولچین و کچەکانی بەهیە و رەحیمە و فاتیمە و ئامینە خانمەکان لەگەڵ کوڕەکانی حەسەن ئەفەندی و عەزیز ئەفەندی داواکاریان پێشکەشی ویلایەتی موسڵ کردووە بۆ ئەوەی مووچەیان بۆ ببڕێتەوە، خشتەی ماوەی خزمەت و ئەو کاغەزانەی پەیوەستن بەم بابەتەوە لە ژمێریاری ڕێکخراوە و لە دەستەی گشتیش وردبینی بۆ کراوە.
ناوبراوی مردوو ماوەی خزمەتی لەگەڵ بری مووچەکەی لە مێژووی مردنی ١٥ ئەیلول ١٣٢٠ هەروەها بە پشت بەستن بە بریارنامەی فەرمانبەرانی خانەنشینی مولکیە ناوبراو هەر یەکە ٣٠ قوروشیان بۆ براوەتەوە، کە کۆی گشتی دەکاتە ٢٠٠ قوروش، لە بارەی مووچەکەی ناوبراو لەسەر بریارنامە مامەڵەکەی جێبەجێ دەکرێت، بۆ ئەمەش نووسرا بۆ سندوق کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٢٢ موحەررەم ١٣٢٣ و لە ١٥ مارت ١٣٢١


ŞD.01035.00082.002

| 5 رەبیعی یەکەم 1323 | 01035.00082 | ŞD. |
|---|---|---|

نەزارەتی سندوقی خانەنشینی مولکیە و دوورخراوان
قەڵەمی نووسین
ژمارە ٤٦٣٥
لە قەزای بازیان خانەنشینی مردوو عەبدولرەحمان بەگ لەلایەن کورەکانی محەمەد رەئوف ئەفەندی و محەمەد رەفیق ئەفەندی و محەمەد شەفیق ئەفەندی لەگەڵ کچەکانی خەدیجە و خێزانەکەی خورشیدە خانم داوایان کردووە مووچەیان بۆ ببڕێتەوە، لەسەر داواکاری ویلایەوتی موسڵ لە ژمێریاری پەراوێزی بۆ ڕێکخراوە، لە دەستەی گشتیش ووردبینی بۆ کراوە.
لە مێژووی ١٠ کانوونی یەکەم ١٣١٦، مووچەی ٦٠٧ قوروش مووچەی خانەنشینی بۆ جێبەجێ کراوە، لە ١ ئەیلوول ١٣٢٠ مێژووی مردنیەوە لەگەڵ بڕیارنامەی خانەنشینی فەرمانبەرانی مولکیەی ئیتر ٣٠٣ مووچەیان بۆ دەبڕێتەوە، لە بارەی مووچەی دیاریکراو بە پشت بەستن بە بڕیارنامە مامەڵەکە جێبەجێ دەبێت، نووسراو بۆ سەندوق کراوە تا جێبەجێ بکرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٥ رەبیعی یەکەم ١٣٢٣ و لە ٢٧ نیسان ١٣٢١



| 1323 جەمادی یەکەم 20 | 01039.00084 | ŞD. |
|---|---|---|

نەزارەتی سندوقی خانەنشینی مولکیە و دوورخراوان
قەڵەمی نووسین
ژمارە ٥٠٢٤
بەڕێوەبەری دارایی شەهرەزوور و گوازراوەی ئەرکەکەی بۆ قەزای بازیان فەتاح ئەفەندی مردووە، لەلایەن کچەکەی ئامینە خان و خێزانەکەی حەبیبە خان داواکاریان پێشکەش کردووە تا مووچەیان بۆ ببڕێتەوە، داواکاریەکە بۆ ویلایەتی موسڵ نێردراوە، لەگەڵ ئەویش خشتەی ماوەی خزمەت و کاغەزی پەیوەندیدار بەم بابەتە لە ژمێریاری پەراوێزی بۆ ڕێکخراوە، لە دەستەی گشتیش ووردبینی بۆ کراوە.
ناوبراو ماوەی کارەکەی و لەگەڵ ئەو برە مووچەیەی کە وەریگرتووە لە مێژووی ١ ئۆغستۆس ١٣٢٠ مردووە، بە گوێرەی بریارنامەی خانەنشینی فەرمانبەرانی مولکیە ناوبراون مانگانە ٨١ قوروش مووچەیان بۆ دەبردرێتەوە، بە پشت بەستن بە بریارنامەی ناوهاتوو مامەڵەکە جێبەجێ دەبێت، بۆ سندوقیش نووسراو کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٠ جەمادی یەکەم ١٣٢٣ و لە ٩ ئۆغستۆس ١٣٢١.


داخلیه مکتوبی قلمی

<table>
<tr><td>14 زیلحیجه 1323</td><td>01040.00034</td><td>DH.MKT.</td></tr>
<tr><td colspan="3">١٤ زیلحیجه ١٣٢٣<br>٢٧ کانوونی یەکەم ١٣٢١<br>بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی<br>لـە قـەزای بازیـان مسـتەفا پاشـا داوای کـردووە بگوازرێتـەوە قائیمقامیەتـی قـەزای هەولێـر، بەهـۆی کارە باشـەکانی هەروەهـا خاوەنـی نیشـانی مەجیـدی نیشـانە لـە پلـەی سـێیەم، لـەم بارەیـەوە ئـەو نـووسراوەی لـە مێـژووی ١ تشرینـی یەکـەم ١٣٢١ ژمـارە ٧٨ کـە لـە ویلایەتـی موسـڵ هاتـووە، پێشـکەش کـراوە و جێبەجـێ کردنـی بە بیـروای فەخامەتپەناهیە.</td></tr>
</table>



| 27 زيلحيجه 1323 | 01051.00078 | DH.MKT. |
| --- | --- | --- |

٢٧ زیلحیجە ١٣٢٣
٨ شوبات ١٣٢١
بۆ نەزارەتی پۆستە و تەلەگرافی پایەبەرز
حەسەن ئەفەندی فەرمانبەری تەلەگرافی بازیان لەبەر ئەوەی هۆکار بووە لە ناردنی هەندێك هەواڵی گرنگ، بۆتە هۆکاری دوورخستنەوەی، ئەمجارە لە تەلەگرافی ویلایەتی موسڵ ئاماژەی پێکراوە و نووسراوەتەوە، بە تێڕوانین لە وێنەی ئاماژە پێکردنەکە، پێویستە هیممەت بکرێت لە ئەنجام دانی کارەکە و رابگەیەندرێت.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
2568 | 192544 | 2

BEO.002568.192544.002

| 30 سەفەر 1323 | 002568.192544 | BEO. |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەتی پایەبەرز
قەڵەمی نووسن
لە موتەسەرفیەتی سلێمانیەوە تەلەگرافنامەی بە شیفرە هاتووە

بۆ دامەزراندنی خاوەن دەسەڵات و لایەنگر محەمەد رەشید بەگ لە قائیمقامیەتی قەزای بازیان، سەرەتا لە ویلایەت باسکراوە، لە کۆتاییدا لە ناو بازیان سەید نوری لەگەڵ هەمەوەندەکان لە نێوانیاندا ئەو ناکۆکیەی روویدا، سەید نوری کوژرا، ناچاری بوو ناوبراو بگوازرێتەوە، هەمەوندەکان زیانی ١٠٠٠٠ لیرەیان بە قەزا گەیاندووە، کە دەبووایە ئەو پارەیە بێتە سەر پارەوپولی میری، جگە لەوەش هاتووچۆکەران و تەنانەت زیانیان بە پۆستەش گەیاندووە، ئەمجارە هەمەوەندەکان زیاتر لەوە لە خۆیان دەرچوون و ئەو قائیمقامانەی لە دەرەوەی قەزا بۆ قەزای ناوهاتوو دادەمەزرێن، ناتوانن لە پشت رووداوەکانی خۆچێی بوەستن، لەبەر ئەوە کارێکی ئەوانە نابینرێت، هەروەها چەندین ساڵە چەندین تاوانبار و سزا دراو دەستگیر نەکراون و ماونەتەوە، بۆیە ئەوەی بتوانێ کارەکان بە ئاسانی ئەنجام بدات و خەڵکی هەژار بپارێزێت و هەروەها هۆکاری نەداوەتە دەست تا هەمەوەندەکان بە تۆڵە سەندنەوە خەریك بن هەروەها رێگەی نەداوە هەمەوەندەکان سەرپێچی بکەن، دەستپێك لە قائیمقامیەتی قەزای ناوهاتوو بە وەکالەت وەریگرتووە، بۆیە بە فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی داوا کراوە لە یەکێك لە قەزاکان دابمەزرێت، بۆیە هەرچی زووە بە پەلە بابا رەسول سەید ئەحمەد ئەفەندی لە قائیمقامیەتی قەزای ناوهاتوو دابمەزرێت، لەبەر گرنگی بابەتەکە بەتکاوە بوێریم کردووە، فەرمان، لە ١٩ نیسان ١٣٢١.

سالم موتەسەرفی سلێمانیە




<table>
<tr><td>BEO.</td><td>002611.195763</td><td>20 ڕەبیعی کۆتایی1323</td></tr>
<tr><td colspan="3">شورای دەوڵەت<br>فەرمانگەی دارایی<br>ژمارە ١٣٩٥<br>نووسراوی مێژووی ١١ ڕەبیعی یەکەم ١٣٢٣ ژمارە ١٠١٠ لە نەزارەتی ناوەخۆ بۆ شورای دەوڵەت حەواڵە کراوە، لە فەرمانگەی دارایی خوێندراوەتەوە.<br>لەبەر بەدەستهێنانی گرنگیەکەی، بە وەکالەت لە قائیمقامیەتی قەزای بازیان بە ڕەزامەندی لەشکری هومایۆن میری ئاڵای تۆفیق بەگ دامەزراوە، مووچەی وەکالەتیش لە ویلایەتی موسڵ نووسراوی بۆ کراوە، هەروەها بڕیارنامەی خەرجی ڕێگا بە بڕیاری ماددەی ٨، مۆڵەت دراوە بۆ جێبەجێ کردنی، هەروەها دابینکردنی بڕی سێ یەك لە مووچەی وەکالەت بۆ ناوبراو گونجاو و بە گوێرەی بڕیارنامە پەسەندە، بۆ ئەمەش نووسراو حەواڵەی نەزارەتی ناوهاتوو کراوە بۆ جێبەجێ کردن، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٠ ڕەبیعی کۆتایی ١٣٢٣ و لە ١١ حوزەیران ١٣٢١.</td></tr>
</table>



| 5 زیلقەعدە 1323 | 002734.205027 | BEO. |
|---|---|---|

فەرمانگەی گشتی ئەرکانی جەنگی
یەکەی چوارەم
٢٤٧٠
راگەیەندراوی بەندەتانە
ئـەو کاروانـەی لـە کەرکووکـەوە بـۆ سـلێمانیە دەڕوات، بـۆ پاراسـتنی ئـەو کاروانـە مەفرەزەیەکـی سـوارە لـە چەمچەماڵـەوە ئەرکی پاراستنی ئـەو کاروانـەی پـێ سـپێردراوە، ئـەو مەفرەزەیـە سـێ کاتژمێـر لـە سـلێمانیە دوورە لـە شـوێنێك بـە نـاوی تاسـلوجە لەلایـەن هـۆزی مەندەمی هێرشـیان کراوەتـە سـەر و ڕووبـەڕووی یەکتر بوونەتەوە، لـە کاروانەکـە گەشـتیارێك کـوژراوە و لـە ئاژەڵـی میریـش دوو سـەر ئەسـپ لـە قاچەکانیـان برینـدار بوونـە، لـە شـوێنی خـۆی ڕاگەیەنـدراوە، لـە فرقـەی قوماندانیەتـی ١٢ ئامـاژەی پێکـراوە، بـۆ تەمبـێ کردنـی هـۆزی ناوبـراو و دەسـتگیرکردنی ئـەو بوێرانـەی کـە بـەم کارە هەڵسـاون، هەروەها سـێ سـەر ئەسـپیش تەرخـان دەکرێـت، هەروەها ئەوانـەی سـەقامگیری ئاسایشـیان تێـك داوە و بـۆ دووبـارە نەبوونـەوەی ئـەو کارانـە هۆکارەکانـی چارەسـەر بکرێـن ئەمـەش بـۆ ویلایەتـی موسـڵ نـووسراوە، قوماندانیەتـی لەشـکری هومایۆنـی شەشـەم تەلەگرافنامـە هاتـووە و تێـدا نـووسراوە، ویلایەتـی ناوبـراو ئـاگاداری پێویسـتی داوە، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.

٥ زیلقەعدە ١٣٢٣ و لە ١٩ کانوونی یەکەم ١٣٢١
رزا سەر عەسکەر



ŞD.02748.00017.001

<table>
<tr><th>11 ڕەبیعی یەکەم 1323</th><th>02748.00017</th><th>ŞD.</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ<br>قەڵەمی نووسین<br>ژمارە ۱۰۱۰<br>بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی<br>ڕاگەیەندراوی بەندەیە<br>بـۆ بەدەسـت هێنانـی گرنگـی جێبەجـێ کردنی کارەکـە بۆ قائیمقامیەتـی قەزای بازیـان بە وەکالـەت، بـە ڕەزامەندی لەشـکری هومایـۆن، تۆفیـق بـەگ میـر ئـاڵای دامـەزراوە، بـۆ خەرجیەکەشـی بـە سـێ یەکـی مووچـەی وەکالەتـی بۆ دابیـن دەکرێـت، لـە ویلایەتـی موسـڵ تەلەگرافنامـە هاتـووە، نووسراوەتـەوە پێویسـتە بـە وەکالـەت کارگێریەکـەی بەڕێـوە ببردرێـت، ئەوانـەی کاری فەرمانبەریـان کـردووە، لـە مووچـەی ئەرکـە کۆنەکانیـان تەنیـا ئـەو ئەرکـەی کـە بـە وەکالـەت وەریانگرتـووە پێنـج مووچـەی دیکەیـان بـۆ دابیـن دەکرێـت، ئـەو وەکیلـەی کـە داشـدەمەزرێت بـە گوێـرەی چیـن و حاڵەتەکـەی زیاتـر لـە پێنـج ئەگـەر شـتێك پێویسـت بـکات، بـە مۆڵـەت وەرگرتـن، لـە مووچـە ڕاسـتەقینەکەی گونجاوە بـری چـوار یـەك و سـێیەکی ئاقچـەی بـۆ دابیـن بکرێـت، بڕیارنامـەی خەرجـی ڕێـگا بـە بڕیارەکانـی ماددەی ۸ هەروەهـا بـە تێروانیـن لـە ڕاگەیەنـدراوی ویلایـەت بـە ووتـەی ژمێریـاری چۆنیەتـی مۆڵـەت دانەکـە ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.<br>۱۱ ڕەبیعی یەکەم ۱۳۲۳ و لە ۳ مایس ۱۳۲۱<br>نازری کاروباری ناوەخۆ</td></tr>
</table>



| 5 شەعبان 1324 | 00062.00050 | I.AS. |
|---|---|---|

پایەی سەر عەسکەر
فەرمانگەی ژاندارمە
٥٨٨
ڕاگەیەندراوی بەندەیە
لـە قـەزای بازیـان تاکـی ژاندارمـە بەشـێکی بـۆ هەمەوەنـد و ئـەو بەشـەی ماوەتـەوەش بـۆ قـەزای کەلعەنبـەر لـە خزمەتـی تایبەتـی قائیمقـام چاقلـی عوسـمان پاشـا کار دەکـەن، لەبـەر ئـەوە ئەوانـە لـە بوونیـان هیـچ سـوودێك نابینرێـت، لەلایـەن ئەمنیەتـی پۆلیسـەوە هـەردوو قـەزا بەرقـەرار نییـە، بـەردەوام تاقمێـك ڕووداو ڕوویـداوە لەگـەڵ ئەوانـەش سـکاڵاکان کەمـی نەکردووە، پشـت بەسـتن بە نیزامنامـەی تایبەتی پێویسـت دەکات بلۆکەکانـی ژاندارمەی هـەردوو قـەزا بەرامبـەر بـە یـەك شـوێنەکانیان بگۆردرێـت، ئەمـەش لـە موتەسـەرفیەتی سـلێمانیە پەسـەند کـراوە و قوماندانیەتـی ژاندارمـە دەنگـی بـۆ داوە، بـۆ جێبەجـێ کردنـی لـە ویلایەتـی موسـڵ نـووسراو هاتـووە کۆتایـی پـێ هێنـاوە، هەروەهـا لـە ویلایەتـی شـاهانە بلۆکەکانـی ئاڵایەکانـی ژاندارمـە لـە شـوێنەکانی خۆیان بـە گوێـرەی ئاماژە پێکـردن بـە ڕەزامەنـدی فەرمانـی پاشـای جەنابـی خەلافەتپەناهـی فەرموویەتـی گۆڕینـەوەی شـوێنەکانیان جێبەجێ دەکرێـت، بلۆکەکانـی ناوبـراو گۆڕینـەوەی شـوێنەکانیان جێگیـر کـراوە، بـەم پێیـە بـە دەسـت کەوتنـی فەرمانـی پاشـای جەنابـی پاشـا فەرموویەتـی ڕابگەیەندرێـت و ئامـاژەی پـێ بکرێـت، ئـەو بریارنامەیـەی لـە فەرمانگـەی ژاندارمـە ڕێکخـراوە پێشکەشـی پێشـەوای سـەدارەتپەناهی کـراوە، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.

٥ شەعبان ١٣٢٤ و لە ١٠ ئەیلوول ١٣٢٢
ڕزا سەر عەسکەر




Y.A.RES.00143.00040.001

| Y.A.RES. | 00143.00040 | 24 زیلحیجە 1324 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆن
٣٨٣٩
بۆ جەنابی دەوڵەت

لە ناو ویلایەتی موسڵ قائیمقامیەتی بازیان بە کراوەیی ماوەتەوە، بۆ ئەم قائیمقامە، وەکیلی قائیمقامی پێشووی قەزای زەیتونە، حوسێن تەڵعەت بەگ دابمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە لەسەر نووسراوی نەزارەتی ناوخۆی جەلیلە کە رەوانەی قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە کراوە، لەوێشەوە ئەو بریارنامەی نێردراوەتە قەڵەم، پێشکەش کراوە و راگەیەندراوە، لەم بارەیەوە بە هەر شێوەیەك بێت فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، بەم راگەیەندراوە نووسراو ژمارەی لێدراوە.

لە ٢٤ زیلحیجە ١٣٢٤ لە ٢٥ کانوونی دووەم ١٣٢٢
سەدری ئەعزەم



ŞD.01051.00084.002

| 26 شەعبان 1324 | 01051.00084 | ŞD. |
|---|---|---|

نەزارەتی سندوقی خانەنشینی مولکیە و دوورخراوان
قەڵەمی نووسین
ژمارە ١٢٠٨
کاتیبی نووسراوی قەزای بازیان ئەسعەد ئەفەندی مردووە، کوڕەکەی حامد ئەفەندی و کچەکەی حەمیدیە و خێزانەکەی خەدیجە خانم بۆ برینەوەی مووچە داوایان پێشکەش بە ویلایەتی موسڵ کردووە، لەگەڵ داواکاریەکە خشتەی ماوەی خزمەت و کاغەزی تایبەت بەم بابەتە لە ژمێریای پەراوێزی بۆ ڕێکخراوە، لە دەستەی گشتیش ووردبینی بۆ کراوە.
خزمەتی پێشووی ناوبراو لەگەڵ بری ئەو مووچەی وەریگرتووە بە بریارنامەی خانەنشینی فەرمانبەرانی مولکیە مانگانە هەر یەکە ٣٠ قوروش کە دەکاتە ١٢٠ قوروش مووچەی مانگانە وەردەگرن، مووچەی باسکراو بە پشت بەستن بە بریارنامە لە سندوق ڕێکخراوە و نووسراوی بۆ کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٢٦ شەعبان ١٣٢٤ و لە ٢٦ ئەیلوول ١٣٢٢




DH.MKT.01113.00052.001

<table>
<tr><th>DH.MKT.</th><th>01113.00052</th><th>29 جەمادی کۆتایی 1324</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>..........<br>٤٦١<br>لە ناو ویلایەتی موسڵ قائیمقامی قەزای بازیان مستەفا پاشا فەرمان دراوە بە گواستنەوەی ئەرکەکەی بۆ قائیمقامیەتی هەولێر، بۆیە بۆ قەزای بازیان قائیمقامی پێشووی خانەقین عەبدوڵڵا موخلیس بەگ لە مولازیمەکانە و زمانی ناوچەکە دەزانێت و ئاشنای خویانە، دادەمەزرێت، هەر کە لە نەزارەتپەناهیش خرایە دەنگدانەوە، جێبەجێ دەکرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە کۆتاییەکانی جەمادی کۆتایی ١٣٢٤ و لە ٧ ئۆغستۆس ١٣٢٢.</td></tr>
</table>

| | | |
|---|---|---|
| 16 سەفەر 1334 | 002804.210245 | BEO. |

١٦ سەفەر ١٣٣٤
٢٨ مارت ١٣٣٢
بۆ نەزارەتی دارایی
ئـەو ماوەیـەی کـە نائیـب بـووە لـە قـەزای بازیـان مووچەکانـی لـە ٥٠٠٠ قـوروش و هەندێـك پێکهاتـووە، داوای کـردووە دابیـن بکرێـت، هەروەهـا بـە هەندێـك ووتـە لەلایـەن یەعقـوب ئەفەنـدی داواکاری دراوە، بـۆ جێبەجـێ کردنـی داوای هیممـەت کـراوە.




<table>
<tr><td>BEO.</td><td>002831.212252</td><td>21 رەبیعی یەکەم 1324</td></tr>
<tr><td colspan="3">٢١ رەبیعی یەکەم ١٣٢٤<br>٢ مایس ١٣٢٢<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>لە فەرمانگەی مولکیەی شورای دەوڵەت بە بیروڕای قۆمیسیۆنی فەرمانبەران وێنەیەکی داواکاری نێردراوە، بۆ جێبەجێ کردنی لە نەزارەتی ناوەخۆ هیممەت بکرێت.<br>بابەتەکە پەیوەستە بە موتەسەرفی پێشووی سانجەقی سلێمانیە ئیلیاس ئەفەندی لەگەڵ قائیمقامی بازیان پەرتو ئەفەندی.</td></tr>
</table>



| 25 جەمادی کۆتایی 1324 | 002893.216906 | BEO. |
|---|---|---|
| ٣ ئۆغستۆس ١٣٢٢<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>شیفرە<br>ئـەو هێـزە سـوارەیەی کـە بـۆ بازیـان دەڕوات، ئەگەر لـە ڕووی کارگێڕیەوە لە ویلایـەت کارەکەیان دابیـن نەکرێت، بە هێـزی بـازووی خۆیـان بژێـوی خۆیـان دابیـن بکـەن، ئـەوا پەنـا دەبەنە بـەر خەڵـك و ناچـار دەبن سـەرپێچی بکەن، هەروەهـا بـۆ ئـەوەی لـە نـاو ویلایـەت ڕێگـری لـە کاری چەتـەی بکرێـت، ئـەو هێـزە سـوارەیەی دەڕوات، ئاماژەی پێکراوە ئاژەڵەکان بفرۆشـن، بەڵام وەڵام وەرنەگیراوە، بە ئاماژەی قوماندانیەتی لەشـکری شەشـەمی هومایۆن ئەمجارە لایەنـی سـەر عەسـکەر ئـاگادار کراوەتەوە، بۆ پاراسـتنی نیزام و ئاسـایش گرنگیەکـەی ڕاگەیەندراوە، بە گوێـرەی ئەوە پەلـە بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی، دووپاتکراوەتـەوە کە بۆ یـەك ڕۆژیش بێـت ڕێگە نەدرێـت ئاژاوە دروسـت بێت. | | |



| | | |
|---|---|---|
| 29 جەمادی کۆتایی 1324 | 002894.216996 | BEO. |

٢٩ جەمادی کۆتایی ١٣٢٤
٧ ئۆغستۆس ١٣٢٢
بۆ لایەنی والای سەر عەسکەر
نووسراوی مێژووی ٢٤ جەمادی کۆتایی ١٣٢٤ ژمارە ٤٧٧ وەڵامی سەر عەسکەر، ئەو مەفرەزە ٥٠ کەسەی کە بۆ بازیان رۆیشتوون، لە شوێنەکە بەرێوەبردنیان رێکخراوە، بەڵام لەلایەن قوماندانەکانی فرقەی ١٢ و لەشکری شەشەمی هومایۆن ئاماژەی بە پەلە بۆ وەکیلی قائیمقامی بازیان نێردراوە، لەبەر ئەوەی ئەو مەفرەزەیەی بەبێ ئەرزاق بەجێ هێشتووە، سکاڵا تۆمار کراوە، ناوبراوان لە فەرمانبەرانی مولکیە کارەکەیان بە ئاسایی بینراوە و بۆ هێزی سوارەی لەشکری هومایۆن ئەو ئاژەڵانەی کە دەفرۆشرێت هەشت یەکی ساڵانی رابردوو رێکدەخرێت، ئەوەی ماوەتەوە رێکخراوە، بۆ دەست کەوتنی خەریکی چاودێری کردنن، چۆنیەتەکەشی بە شێوەی هەنگاو بە هەنگاو بە لەشکری هومایۆن راگەیەندراوە، هەروەها مەفرەزەی ناوبراو بۆ رێکخستنی بەرێوەبردنەکەی دووبارە ئاگاداری بۆ شوێنی مەبەست نێردراوە، لە ویلایەتی موسڵ بە تەلەگرافنامە بۆ وەڵامەکەی نووسراو دەنووسرێتەوە.




BEO.002915.218580.002

<table>
<tr><td>BEO.</td><td>002915.218580</td><td>4 شەعبان 1324</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە<br>ژمارە ٢٤٧<br>نووسراوی ٩ رەجەب ١٣٢٤ ژمارە ٢٥٣٧ لە نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە حەواڵەی قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە کراوە، نووسراوەکە خوێندرایەوە. لە ناو ویلایەتی موسڵ قائیمقامی قەزای بازیان مستەفا پاشا ئەرکەکەی بۆ قائیمقامیەتی قەزای هەولێر گوازراوەتەوە، ناوبراو لە چینی دووەم و لە مولازمەکانی قائیمقامیەتی قەزای بازیان بووە، دەرکەوتووە عەبدوڵڵا موخلیس بەگ قائیمقامی پێشووی خانەقینیش ئامادە بە دامەزراندنی کراوە. بە تێروانین وەرگێراوی زانیاری عەبدوڵڵا موخلیس بەگ وەرگێراوەکە رێکخراوە، لە بارەی دامەزراندنی کەسێکی تر لە نەزارەتی ناوهاتوو نووسراو حەواڵە کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٤ شەعبان ١٣٢٤ و لە ٩ ئەیلوول ١٣٢٢.</td></tr>
</table>


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
2934 220023

<table>
<tr><td>BEO.</td><td>002934.220023</td><td>4 رەمەزان 1324</td></tr>
<tr><td colspan="3">٤ رەمەزان ١٣٢٤<br>٨ تشرینی یەکەم ١٣٢٢<br>بۆ لایەنی والّای سەر عەسکەر<br>وێنەی سەروو نووسراو راگەیەندراوە، فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی بە گوێرەی پەراوێزەکەی نێردراوەتە لایەنی والّای سەر عەسکەر تا هیممەت بکرێت بۆ جێبەجێ کردنی.<br><br>لە بارەی گۆرینەوەی شوێنی بلۆکەکانی ژاندارمەی قەزاکانی کەلعەنبەر و بازیان.</td></tr>
</table>




DH.TMIK.S.00071.00035.001

| | | |
|---|---|---|
| DH.TMIK.S. | 00071.00035 | 17 زيلحيجه 1325 |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لە ناو سێ ویلایەت بێ دەنگی زیادی کردووە و ماوەیەکی زۆرە هێڵی تەلەگراف پچراوە، نۆژەنکردنەوەی ئەو هێڵانە دەستی پێکردووە، لە مێژووی ٦ کانوونی دووەم ١٣٢٣ لەگەڵ تەلەگرافنامەی بەندە راگەیەندراوە و ئاماژەی پێکراوە، لە دەوروبەری سلێمانیە بە زەبری چەك دەستیان پێ کردووە، هەروەها ماوەیەکی زۆرە لەلایەن کوردەکان و هۆزەکانەوە وێران کردن و پچرانی هێڵی تەلەگرافی نێوان سلێمانیە و بازیان هەروەها لە نێوان چەمچەماڵ و کەرکوك لەگەڵ مەخمور و هەولێر ئەنجام دراوە، بۆیە دەست بە چاککردنەوەی هێڵەکان کراوە، بۆ ئەمەش پێویستە کەمتەرخەمی نەکرێت و پێویستە نزا بۆ هومایۆن بکرێت تەمەن درێژ و سەلامەت بێت، بەم شێوەیە دووبارە نزا کراوەتەوە، ئەو نووسراوەی کە لە باش مودیریەتی پۆستە و تەلەگرافی بەغداد وەرگیراوە، راگەیەندراوە بە راگەیاندنی زانیاریەکان بوێری کراوە، فەرمان، لە ٧ کانوونی دووەم ١٣٢٣.
نازم سەرۆکی چاککردنەوەی دەستەی هێڵی عیراق




DH.TMIK.M.00239.00006.005

| DH.TMIK.M. | 00239.00006 | 20 موحەڕڕەم 1325 |
| --- | --- | --- |

فەرمانگەی ئەرکانی گشتی جەنگی
یەکەی چوارەم
٣١٨٣
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
بۆ جەنابی دەوڵەت
نـوسراوی مێـژووی ٢٣ کانوونـی یەکـەم ١٣٢٢ ژمـارە ٢٩٩ وەڵامـی نەزارەتپەناهیـە، هێڵـی تەلەگرافـی نێوان سـلێمانیە و چەمچەمـاڵ ماوەیەکـی زۆرە تێکچـووە و بـۆ قەدەغەکردنـی وێران کردنیشـی مەفرەزەیەکی ٣٠ سـوارەی ئێسـتر لە چەمچەمـاڵ جێگیـر بکرێـت، بـۆ ئەم مەبەسـتەش وەڵامـی ئـەو ڕاگەیەندراوەیە کە پێشـووتر ڕۆیشـتوە، تەلەگرافنامە لـە ژێـر قوماندانیەتـی لەشـکری شەشـەمی همایـۆن هاتـووە و چۆنیەتـی کارەکـە بـە قوماندانیەتـی فرقـەی ١٢ ڕاگەیەنـدراوە، لـە وەڵامـدا تەلەگرافنامـە هاتـووە، بـۆ ڕێگـری کـردن و قەدەغەکردنـی وێرانکردنـی تەلەگرافـەکان و ڕاگرتنـی سـنووربەزاندنی هەمەوەنـدەکان و دەسـتگیرکردنیان، بـەو مەفرەزەیـە ناکرێـت کـە لـە ٣٠ تاکـەی سـوارەی ئێسـتر پێکهاتـوون، ئەگـەر بکرێـت لـە ژێـر قوماندانیەتـی یـەك ئەفسـەر لـە هێزێکـی ١٠٠ کەسـی کەمـتر نەبێـت، ئـەو فرقـە باسـکراوەش ئەگـەر هێـزی سـوارە بێـت ئـەوا لـە شـوێنە جیاجیـاکان بـە ئەرکـی زەوی خاوەندارێتـی و مەروماڵاتــەوە خزمـەت دەکـەن، بۆیـە نـووسراو کـراوە و نووسراوەتـەوە بـۆ ئـەم کارە یـەك ئەسـپ سـوار لـە ژێـر دەسـتدا نییـە تاوەکـو ڕێکبخرێـن، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ٢٠ موحـەڕڕەم ١٣٢٥ و ٢٠ شـوبات ١٣٢٢.
ڕزا سەر عەسکەر




DH.TMIK.M.00239.00036.010

| DH.TMIK.M. | 00239.00036 | 22 ره‌بیعی یه‌كه‌م 1325 |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>فه‌رمانگه‌ی سه‌داره‌تی پایه‌به‌رز<br>قه‌ڵه‌می نووسین<br>ژماره ٥٥٨<br>بۆ نه‌زاره‌تی ناوه‌خۆی جه‌لیله<br>بۆ جه‌نابی ئه‌فه‌ندم<br>له ناو قه‌زای بازیان بوێریان كردووه كاری نه‌شیاو ئه‌نجام بده‌ن، بۆ ته‌مبێ كردنی چه‌ته‌كانی هه‌مه‌وه‌ند له‌شكری چواره‌می هومایۆن ئه‌ركی پێ سپێردراوه و له شوێنه دیاری كراوه‌كاندا له‌و سه‌ربازه شاهانه‌ی كه جێگیر كراون، له‌گه‌ڵ دوو تابور به شێوه‌یه‌كی كاتی له تابوری ئێستر سواره‌ی دیره‌زور ٢٠٠ نه‌فه‌ر خراوه‌ته ژێر ده‌سه‌ڵاتی قوماندانیه‌تی میری لیوا یوسف پاشای سه‌رۆكی قۆمیسیۆنی ئه‌ملاكی سه‌نیه‌ی عه‌ماره، له ناردنی بۆ قه‌زای ناوهاتوو له ویلایه‌تی موسڵ هه‌واڵ دراوه، له‌سه‌ر نووسراوی ٢ سه‌فه‌ر ١٣٢٥ ژماره ٣٦٨ به گفتوگۆ له مێژووی ١٧ ره‌بیعی یه‌كه‌م ١٣٢٥ ژماره ٤٠٨ وه‌ڵام له سه‌ر عه‌سكه‌ری والا هاتووه، هاوپێچ بۆ ده‌وڵه‌ت نێردراوه، به سه‌یر كردنی نووسراوه‌كان داواكراوه هیممه‌ت بكرێت له جێبه‌جێ كردنی، له ٢٢ ره‌بیعی یه‌كه‌م ١٣٢٥ و ٢٢ نیسان ١٣٢٣.<br>سه‌دری ئه‌عزه‌م | | |




تلغراف نامه



DH.ŞFR.00378.00112.001

| 9 ڕەبیعی یەکەم 1325 | 00378.00112 | **DH.ŞFR.** |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لە قەزای بازیان زەوی کشتوکاڵی حەفید شێخ سەعید ئەفەندی تووشی پەلاماری هەمەوەندەکان بووە، ئەوانیش وازیان لە گوندەکانیان هێناوە، بۆ ڕێگەگرتن و تەمبێ کردنیان تا ئێستا ئەو زەرەروزیانانەی کە کردوویانە بۆ دابین کردن و گەڕانەوەی ئەو تاڵانکراوانەی کە بردراوە، لەلایەن موتەسەرفیەتی سلێمانیە ڕاگەیەندراوە هەروەها بە فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی لە کاتی دوورخستنەو و گواستنەوەی هەمەوەندەکان بە تێروانین لە تایبەتمەندییەکانی ڕاگەیەندراوەکان بە وردیەوە ئەنجام دەدرێت، جگە لەمە پێویست بکات سەربازی شاهانە ڕەوانی بازیان دەکرێت ئەمەش لە تەلەگرافنامەی ٢٠ مارت ١٣٢٣ ڕاگەیەندراوە، فەرمان، ٩ نیسان ١٣٢٣.

مستەفا والی موسڵ

DH.ŞFR.00379.00026.001

| DH.ŞFR. | 00379.00026 | 15 رەبیعی یەکەم 1325 |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

هاوپێچـی تەلەگرافـی بەندەمانـە لـە مێـژووی ٨ نیسـان ١٣٢٣، لـە هۆزەکانـی بازیـان لەوانـە هەمەوەنـدەکان لـەم ڕۆژانـە دەسـتیان بـە چالاکـی و جموجۆڵـی نەشـیاویان کردۆتـەوە، بـۆ زیادکردنـی مـەرام و ئـەم بارودۆخـە، بـۆ سـەقامگیری و بەرقەراربوونـی ئاسـایش و ئاسـوودە بوونـی دانیشـتووان مەفـرەزەکان لـە سـەربازی شـاهانە ڕێـك بخرێـت و بنێردرێـن، بـە ئامـاژەی قائیمقامیـەت، بـە موتەسـەرفیەتی کەرکـووك ڕاگەیەنـدراوە، لـەم بارەیـەوە تەلەگرافنامـەی مێـژووی ٢٠ مـارت ١٣٢٣ بەپەلـە جێبەجـێ بکرێـت، فەرمـان.

١٥ نیسان ١٣٢٣

مستەفا والی موسڵ


İ.DH 1464/19 /1326.S/29

İ.DH.01464

| | | |
|---|---|---|
| I.DH. | 01464.000019 | 21 زیلقەعدە 1325 |

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ٣٩٠٢
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
ڕاگەیەندراوی بەندەیە

لە ویلایەتی موسڵ بۆ قائیمقامیەتی قەزای بازیان حوسێن ئەفەندی دادەمەزرێت، پێشەکی بە نووسراو ڕاگەیەندراوە و ئاماژەی پێکراوە، لە قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە بریارنامە لە مێژووی ٢٣ کانوونی دووەم ١٣٢٣ ڕێکخراوە و پێشکەشی پێشەوا سەدارەتپەناهی کراوە، ئەگەرچی بە لێکۆڵینەوە دەرکەوتووە، بەڵام هێشتا ئەنجامەکەی دەرنەچووە، هەروەها لەبەر گرنگی شوێنەکەی گونجاو نییە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بە وەکالەت ئەوێ بەڕێوە ببات، بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی سەرووە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢١ زیلقەعدە ١٣٢٥ و لە ١٣ کانوونی یەکەم ١٣٢٣.

نازری کاروباری ناوەخۆ



| | | |
|---|---|---|
| 19 تەمموز 1325 | 02888.00086 | DH.MKT. |

- بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لە ١٣ تەمموز ١٣٢٥ موتەسەرفی کەرکووك و قوماندانی هێزی چاودێری مەزهەر بەگ ئەرکی موتەسەرفیەتی داوەتە فرقەی رەدیفی وەکیلی قوماندن زەکی پاشا و ئەو هێزەی ماوەتەوە لەگەڵ خۆی بۆ مەرکەزی قەزای بازیانی بردووە، هەروەها هێزی گشتی لە کەرکووك جولەی کردووە بۆ چەمچەماڵ بەرێکەوتووە، لە بارەی ئەندامەکانی دیوانی عورفی لە ٤ تەمموز ١٣٢٥ لە وەڵامی تەلەگرافنامەی بەندە بە تکاوە فەرمانی داوە، لە ١٨ تەمموز ١٣٢٥.

رەشید والی موسڵ

- ١٩ تەمموز ١٣٢٥
بۆ ویلایەتی موسڵ
بەپەلەیە
ئەو دیوانی عورفی جەنگییەی کە لە قەزای بازیان دادەمەزرێت، لە موسڵ بە سەرۆکایەتی قوماندانی لیوای هەژدەی سوارە، میری ئالا ئەنیس بەگ، بە شەش ئەفسەر لە پلەی جیاواز دیوانەکەی رێکخستووە، لەم بارەیەوە لێکۆڵینەوەی سەرەتایی و مامەڵەی لێپرسینەوە جێبەجێ کراوە، هەروەها بە پێویست زانراوە بە هەڵبژاردن دەستەی لێکۆڵینەوە رێك بخرێت کە سێیان لە فەرمانبەرانی دادوەری و سێیان لە ئەفسەر بێت و بە هاوەڵی دیوانی جەنگی باسکراودا ئامادە دەبێت، لە وەڵامدانەوەی لەشکری شەشەمی هومایۆن نووسراو بۆ نەزارەتی جەنگی و نەزارەتی دادوەری نوسراوە و زانیاری دراوە.

نمونه ۱

دولت علیه عثمانیه پوسته و تلغراف نظارتی

تلغرافنامه

TÉLÉGRAMME

L'état n'accepte aucune responsabilité à raison du service de la télégraphie

| | |
|---|---|
| ژورنال نومروسی | |
| سوق نومروسی | ١٢٠ |
| ارسال تاریخی | ١٨ تموز ٢٥ |
| ارسال ساعتی | |
| سوق مأموری | [illegible] |

| | |
|---|---|
| موسط مرکز | |
| مخرج مرکزی | موصل |
| کشیده ایدن مأمور | |
| اخذ ایدن مأمور | |
| اخذ تاریخی وساعتی | ١٨ تموز ٢٥ |

| محل نومروسی N° du dépôt | کلمات Nombres des mots | غروب Group | محل تاریخی Date du dépôt | ساعت Heures | دقیقه Minutes | روز ویا شب Matin ou Soir | طریق Voies | اشارات مخصوصه Indications non taxées |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٨٨٦٥ | ٥٠ | | ٢٤ | | | | | |

١٨ تموز ١٣٢٥

داخلیه نظارت جلیله‌سنه

۲۵ تموز ۱۲ ده کرکوکده متوقف وقوه تعقیبیه قومندانی مظهر بك [illegible]
بالتوزیع قوای متباقیه‌ده بالاستصحاب بازیانه
ردیف [illegible] قومندانی وکیلی [illegible] پاشا
قضاسی [illegible] وقوه عجله ایله [illegible] بولنان چمچمال متوجهاً کرکوکدن
۲۱ تموز ۲۵ تلغرافنامه عاجزی
حرکت اینجه‌جه دیوان عرفی اعضاری حضراتی
جوابه اراده بیورلمش [illegible] ۱۸ تموز ۲۵

موصل والیسی
بشیر



DH.MKT.02888.00086.001



| | | |
|---|---|---|
| 11 سەفەر 1325 | 003020.226455 | BEO. |

١١ سەفەر ١٣٢٥
١٣ مارت ١٣٢٣
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لەسەر بەردەوام بوونی کاری چەتەگەریان، لە کاتی خۆی دەستگیرکراون و بۆ رۆژئاوای تەرابلوس و بەنغازی و ئەدەنە دوور خراونەتەوە، دواتر چەتەکانی هەمەوەند بەهەر شێوەیەك بێت هەڵاتوون و گەراونەتەوە قەسەبەی بازیان ئەو شوێنە کۆنەی کە کاری چەتەیان تێدا ئەنجام دەدا، مەفرەزەی جیا جیا لە ٣٠ تا ٤٠ ئەسپ سواریان پێك هێناوە وەکو جاران دەستیان بە پەلاماردانی خەڵك و زیان گەیاندن کردووە، هەروەها لەبەر خراپەکاری ئەوانە کشتوکاڵ و کاری بازرگانی تووشی وەستان هاتووە، ئەو تەلەگرافنامەیەی کە لە کەرکووك دەرچووە لەگەڵ راگەیاندن و ئاماژە پێکردن داوا لە سەروو کراوە، لەسەر زانیاری پێشووی بارودۆخی ئەوانە ئەمجارە بە تێروانین لە رووداوەکان لێکۆڵینەوە لە توندوتیژی چەتەکان کراوە، هەرچی زووە دەستگیر بکرێن و توندوتیژی و پەلامار و زیانی ئەوانە لە خەڵکی ملکەچبوو دوور بخرێتەوە، پێویستە بپارێزرێن، ئەگەر پێویستیش بکات مەفرەزە لە ئاڵای سوارە پێك بهێنرێت و کار بکەن بۆ دوورخستنەوەی ئەوانە، فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی فەرموویەتی بە گوێرەی ئەو کارە هەرچی زووە ئەنجامەکەی رابگەیەندرێت، چۆنیەتیشی بە لایەنی سەربازی راگەیەندراوە، لە نێوان باش کیتابەتی جەلیلەی هومایۆنی ملوکانە بە نووسراو راگەیەندراوە، بە نووسراوێکی ئەمر و فەرمانی هومایۆن هیممەت بکرێت بۆ جێبەجێ کردنی کارەکان.


صدارت عظمی مکتوبی قلمی

طرف والای سرعسکریه

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
3045 / 228363

| BEO. | 003045.228363 | 17 ڕەبیعی یەکەم 1325 |
|---|---|---|

- ١٧ ڕەبیعی یەکەم ١٣٢٥
١٧ نیسان ١٣٢٣
بۆ لایەنی واڵای سەر عەسکەر

هاوپێچی نووسراوی ٢٨ سەفەر ١٣٢٥، حەفید شێخ سەعید ئەفەندی ئەو زەوی کشتوکاڵەی لە قەزای بازیان هەیەتی، دووبارە تووشی پەلاماری هەمەوەندەکان بووە و ناچار بوونە واز لە گوندەکانیان بهێنن، ئەمەش لە موتەسەرفیەتی سلێمانیە دوای ڕاگەیاندنی، لە ویلایەتی موسڵ تەلەگرافنامە بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە نێردراوە تاوەکو بە پەلە سەربازی شاهانە ڕەوانەی بازیان بکرێت، لەگەڵ مێژووی ١٥ ڕەبیعی یەکەم ١٣٢٥ ژمارە ٦٥٤ نەزارەتی ناهاتوو لەگەڵ تەلەگرافنامەکە هاوپێچ بۆ واڵای سەر عەسکەر نێردراوە، بە تێروانین لە ئاماژەی پێشوو جێبەجێ بکرێت و ڕابگەیەندرێت.

- لەسەر نووسراوی یەکەم لە مێژووی ٢٨ سەفەر ١٣٢٥ نوسراوی سەدری ئەعزەم بۆ لایەنی واڵای سەر عەسکەر نووسراوەتەوە، هێشتا وەڵامەکەی نەهاتووە.




۵

اوکی تلغرافی ادرنه ۲۸ حزیران ۳۲۵ تاریخنده طرف والای سامیلرینه

تلغرافه سبب یازلمشسه هنوز جوابی گلمامشدر



BEO.003045.228363.002



BEO.003048.228552.005

| 18 سەفەر 1325 | 003048.228552 | BEO. |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
ئەو تەلەگرافنامەیەی بە شیفرەیە کە لە ویلایەتی موسڵ هاتووە
لە ١٨ مارت ١٣٢٣ لە بازیان هۆزی هەمەوەند نیشتەجێیە، لە ماوەی چەند ساڵێکدا ئەگەر بۆ یەك جاریش بێت دوورنەخرێنەوە، ئەو سنووربەزاندنانە و زیانانەی کە لە خەڵکی بێ دەسەڵات دراوە، بە توندی ئیدانە کراوە و پەسەند کراوە بە نموونە، لە تەلەگرافنامەی بەندەمان ٦ و ١١ مارتی ١٣٢٣ پشتگیری کراوە، فەرمانی پاشای جەنابی پاشا بۆ ئەو کەسانەی کە دڵسۆزی دەوڵەتن پێویستیان بە چاودێری و پاراستنە، ئەگەر بە پێویست بزانرێت دوای پێداچوونە بە سوارەی ئاڵایەکان، ئەوا ئێستا لە لەشکری چوارەمی هومایۆن لەم ناوەیە دوو تابور بە قوماندانیەتی میری لیوا یوسف پاشا سەرۆکی قۆمیسیۆنی خاوەنداریەتی سەنیەی عەمارە بدرێت، لە دیرەزوریش ئەو تابورەی لە سوارەی ئێستر بوونی هەیە بە ٢٠٠ نەفەر، بە یەکەوە بۆ بازیان بڕوات، فەرمانی ئەمەش بدرێتە ئەوانەی بەرپرسن، فەرمان، لە ٢٠ مارت ١٣٢٣.
مستەفا والی


٢٠٨٩

3117 233727 2

BEO.003117.233727.002

<table>
<tr><th>BEO.</th><th>003117.233727</th><th>23 جەمادی کۆتایی 1325</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ<br>قەڵەمی نووسین<br>٢٠٨٩<br>بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی<br>راگەیەندراوی بەندەتانە<br>لە ناو ویلایەتی موسڵ بۆ قائیمقامیەتی قەزای بازیان هەڵبژێردراوە، بەڵام هێشتا فەرمانی دەست بەکاربوونی بۆ دەرنەچووە و مووچەی دابرانیشی نییە، دووچاری تەنگانە بووە، بۆیە لەلایەن حوسێن تەڵەعەت ئەفەندی داواکاری پێشکەشی جەنابی پاشا کردووە، لەبەر ئەوەی تا ئێستا فەرمانی دەست بە کار بوونی بۆ دەرنەچووە، هەروەها بە تێروانین لە داواکاریەکە لە رێگەی پاشاوە بۆ ناوبراو ١٥٠ قوروش بە هاوکاری جەنابی خەلافەتپەناهی ببرێتەوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، ٢٣ جەمادی کۆتایی ١٣٢٥ و ٢١ تەمموز ١٣٢٣.<br>نازری کاروباری ناوەخۆ</td></tr>
</table>

| 15 رەمەزان 1326 | 00274.00075 | DH.TMIK.M. |
|---|---|---|
| ٢٨ ئەیلوول ١٣٢٤<br>تەلەگراف بۆ ویلایەتی موسڵ<br>لەلایەن هەندێك شێخەکانی چەمچەماڵ لە ٢١ ئەیلوول ١٣٢٤ تەلەگراف دەرچووە، وێنەیەکی بەپەلە بردراوە چونکە پێویستی بە لێکۆڵینەوە و خوێندنەوە بووە، تا جێبەجێ بکرێت، لەگەڵ جێبەجێ کردنی ئەنجامەکەی و تێبینیەکانی ئاماژەی پێ بکرێت. | | |

DH.ŞFR.00406.00098.001

<table>
<tr><td>DH.ŞFR.</td><td>00406.00098</td><td>10 ڕەجەب 1326</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی ناوەخۆ<br>مێژووی ١٩ تشرینی یەکەم ١٣٢٤ هاوپێچی تەلەگرافنامەیە، قائیمقامیەتی کەلعەنبەری بە وەکالەت قەبوڵی نەکردووە، خۆی لە بینباشی ژاندارمەیە، ئەمڕۆ بە وەکالەت لە قائیمقامیەتی قەزای بازیانە، خاوەن توانا و هێزە، ساڵح بەگ لە قائیمقامیەتی کەلعەنبەر ڕەزامەندی بفەرمووێت، ناوبراو بۆ ئەوێ دەنێردرێت و دادەمەزرێت، بۆ تەواو کردنی هۆکارەکان داوای هاوکاری کردووە، فەرمان.<br>٢٦ تەمموز ١٣٢٤<br>فەریق زەکی والی موسڵ</td></tr>
</table>




DH.MKT.01183.00074.027

| DH.MKT. | 01183.00074 | 11 جەمادی کۆتایی 1326 |
|---|---|---|
| نەزارەتی پۆستە و تەلەگراف<br>قەڵەمی نووسین<br>ژمارە ۳۳۲<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>بۆ جەنابی ئەفەندم<br>لە چەمچەماڵ لایەنی کەرکووك هێڵی تەلەگرافی دزراوە، بە زانیاری فەرمانبەرانی پاراستنی هەردوو لا، لە خەڵکی گوندەکانی دەوروبەر وەرگیراوەتەوە و لە شوێن خۆی دانراوەتەوە، بەڵام دیسان لە چەمچەماڵ لایەنی سلێمانیە تاقمێك دزراون، ئەم حاڵە بەردەوام بێت، دەرکەوتووە هێڵی سلێمانی لە ماوەیەکی کورتدا لەناوچووە و وێران بووە، ئەمەش لە شوێن خۆی بە گوێرەی ئاماژەکانەوە دەرکەوتووە، بۆ جێبەجێ کردنی ئەمر و فەرمان لە ویلایەتی موسڵ دەرچووە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ۱۱ جەمادی کۆتایی ۱۳۲٦ و لە ۲٦ حوزەیران ۱۳۲٤.<br>نازری پۆستە و تەلەگراف | | |

| 20 شەوال 1326 | 02647.00071 | DH.MKT. |
|---|---|---|

- بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
شیفرەی ئەو تەلەگرافنامەیەیە کە لە ویلایەتی موسڵ هاتووە
خەڵکی سلێمانیە دوکانەکانیان داخستووە پەیمان و بەڵێنیان داوە بۆ ئەوەی شێخ سەعید و کوڕەکانی لە ناو ببەن، بۆ ئەم مەبەستە چەکیان هەڵگرتووە، بۆ هێور کردنەوەی ئەو خەڵکە ناوبراو لەگەڵ کوڕەکەی ناوبراو بە ناچاری بە ڕێگەی دوو پیاو بەبێ رووداو هێنراون و خراونەتە ژێر چاودێری نەزارەتەوە، هەروەها بۆ ئەوەی خەڵك پەرشوبڵاو بکرێنەوە هەرچەند هەنگاو و ئامۆژگاری دراوە، بەڵام تا ئەو پیاوانە لە سلێمانی دەرنەهێنین ئەستەمە بتوانین پەرشوبڵاویان بکەین، ئەم قسانە بە مەتران ووتراوە، بۆ ئەوەی رووداوەکە گەورەتر نەبێت لە موتەسەرفی سلێمانیە راگەیەندراوە کە شێخ بهێنرێتە ویلایەت، هەروەها بۆ موتەسەرفیەت نووسراوە کە ئاسایش بە قەرار بکرێت و ژیانی شێخ بپارێزرێت و رێگە نەدرێت رووداو رووبدات و گەورە بێت، بۆ ئەم مەبەستە ئامادەکاری تەواو کراوە و رەزامەندی دراوە لە وەڵامدا بۆ موتەسەرفیەت نووسراوە بۆ ئەوەی خەڵکی بە پەرۆش هێمن بکرێتەوە و بە گوێرەی جێبەجێ کردنی کارەکان بە گەیاندنی شێخ سەعید بۆ مەرکەز بە وون بوونی خەڵکەکە کۆتایی بە سنوور بەزاندن دەهێنن، بۆ ئەمەش بۆ فرقەی کەرکووك نووسراوە پێویستە مەفرەزەیەکی تەواو رەوان بکرێت، لە کاتی ئەم کارەش بە گفتوگۆ لەگەڵ سلێمانی هێڵی تەلەگراف نێردراوە، لەمە زیاتر زانیاری نەدراوە، زانیاری یەك مانگ راگەیەندراوە، فەرمان، لە ٢١ تشرینی یەکەم ١٣٢٤.
زەکی والی فەریق

- فەرمانگەی ئەرکانی گشتی جەنگی
یەکەی سێیەم
١٥٥
بۆ نەزارەتی ناوەخۆ
بۆ جەنابی دەوڵەت
مێژووی ٢٢ تشرینی یەکەم ١٣٢٤ ژمارە ٣١ وەڵامی نووسراوی نەزارەتە، پێشەکی لە ویلایەتی موسڵ هەواڵ نێردراوە، تابوری یەکەمی ئالای ٤٨ لە چەمچەماڵ، کە لە ١٠٠ کەس پێك دێن، لەگەڵ تابوری ئێستر سواری کەرکووك کە لە ١٤٠ کەس پێك دێت، نێردراونەتە چەمچەماڵ، هەروەها شێخ سەعید ئەفەندی و کوڕەکانی شێخ محەمەد و نەقیب شێخ مەعروف بابا رەسول زادە سەید ئەحمەد و موفتی پێشوو سەید محەمەد ئەفەندی زادە شێخ ساڵح ئەفەندی رادەستی ئەو مەفرەزەی ئێستر سوارە کراون کە گەیشتونەتە چەمچەماڵ، ئیبراهیم ئەفەندی یوزباشی ئێستر سوارەکە بە شەو لە سلێمانیە دەرچووە، ئەمەش بە ئاماژەی قوماندانیەتی سلێمانیە بە میهرەبانیەوە بە وەکالەتی قوماندانیەتی فرقەی ١٢ راگەیەندراوە، لە وەکالەتی قوماندانیەتی لەشکری شەشەمی هومایۆن تەلەگرافنامە نووسراوەتەوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٠ شەوال ١٣٢٦ و لە ٢ تشرینی دووەم ١٣٢٤.
نازری جەنگی




| BEO. | 003272.245390 | 15 سەفەر 1326 |
| --- | --- | --- |
| ١٥ سەفەر ١٣٢٦<br>٥ مارت ١٣٢٤<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>لە ناو ویلایەتی موسڵ بۆ قائیمقامیەتی قەزای بازیان بریکاری قائیمقامی پێشووی قەزای زەیتونە حوسێن تەڵعەت بەگ دابمەزرێت، لەم بارەیەوە نووسراوی دەوڵەت لە مێژووی ٢١ زیلقەعدە ١٣٢٥ ژمارە ٣٩٠٢ بە بریاری قۆمیسیۆنی مولکیەی فەرمانبەران بە مۆڵەتی فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی لە مێژووی ١٤ سەفەر ١٣٢٦ فەرموویەتی، بۆ جێبەجێ کردن هیممەت بکرێت. | | |


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
3330 | 249695

| | | |
|---|---|---|
| **5 جەمادی کۆتایی 1326** | 003330.249695 | BEO. |

٥ جەمادی کۆتایی ١٣٢٦
٢٢ مایس ١٣٢٤
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە

بە ئەمر و فەرمانی هومایۆنی شاهانە تابور بۆ پەسفی دەروات، لە شەش سەد و پێنج سەد نەفەر پێك هاتوون لە داقوق و چەمچەماڵ تابورەکانی رەدیف کە ٩ ساڵە لە نەفەری رەدیفن، لەم ساڵە لە ١٥ ی نیسان بە مووچەی مانگانە ١٠ قوروش و نیو هەروەها دامەزراندنی موتەفەریقە پێداویستی و ئامادەکاریەکان ٦٣٦٣١٣ قوروش لە خەزینەی نیزامیە لەم ساڵە لە بودجەی ئەمرۆ بە زیادکردن و دانانەوە لە پارەوپولی ویلایەتی موسڵ حەواڵە بکرێت، هەروەها حەواڵە نامە بۆ شوێنی خۆی بروات، خەریکە هەژمارەکە جێبەجێ دەبێت، لە ئێستاوە دەست بە کارەکان کراوە، نووسراوی باڵای سەر عەسکەر لە مێژووی ٤ جەمادی یەکەم ١٣٢٦ ژمارە ٣٧٩ بۆ دەوڵەت نێردراوە، بۆ جێبەجێ کردنی هیممەت بکرێت و هەواڵیش بنێردرێتەوە.



| 5 جەمادی کۆتایی 1326 | 003350.251206 | BEO. |
|---|---|---|
| ٥ جەمادی کۆتایی ١٣٢٦<br>٢١ حوزەیران ١٣٢٤<br>بۆ لایەنی واڵای سەر عەسکەر<br>مێـژووی ٤ جەمـادی یەکـەم ١٣٢٦ ژمـارە ٣٧٩ وەڵامـی نـووسراوی سـەر عەسـکەرە، تابـوری رەدیفـی داقـوق و چەمچەمـاڵ مـاوەی ٩ سـاڵە ئەندامانـی رەدیـف هـاوکارن، ئـەم سـاڵە لـە ١٥ی نیسانەوە بـە ١٠ قـوروش و نیـو مووچە و لەگـەڵ خەرجیەکانیـان دادەمەزرێـن، جگـە لـەوە پێداویسـتیان ٦٣٦٣١٣ قـوروش لـەم سـاڵەوە بـە هەژمارکردنـی داهـات لـە پارەوپولـی ویلایەتـی موسـڵ جێبەجـێ دەکرێـت، بـۆ حەواڵـە کردنـی حەواڵەنامـە بـۆ لایەنـی واڵای سـیپاهیدار نێـردراوە، بـرە پـارەی ناوبـراو بـە مۆڵەتدانـی قۆمیسـیۆنی دارایـی سـەروو جێبەجـێ دەبێـت، ئـاگاداری بـە تەلەگرافنامـە بـۆ دەفتـەردار نێـردراوە، بـە گفتوگـۆ نەزارەتـی دارایـی جەلیلـە وەڵامـی داوەتـەوە. | | |




<table>
<tr><td>14 شەعبان 1326</td><td>003397.254717</td><td>BEO.</td></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی کاروباری دارایی<br>ژمێریاری دەفتەری گەورە<br>١٣٠٤<br>راگەیەندراوی بەندەتانە<br>بـە ئەمـر و فەرمانـی هومایۆنـی جەنابـی خەلافەتپەناهـی تابورێـك چەكـی پێـدراوە، بـۆ پەسـفە دەنێردرێـت، تابورەکانـی رەدیفـی داقـوق و چەمچەمـاڵ مـاوەی ٩ سـاڵ نەفـەرە رەدیفەکانـی لـەم سـاڵە مانگـی نیسـانی ١٥ بـە مووچـەی ١٠ مانـگ و نیـو هەروەهـا لەگـەڵ دامەزراندنـی موتەفەرقـە کەلوپـەل و پێداویسـتی ٦٣٦٣١٣ قـوروش لـە بوودجـەی ئـەم سـاڵی خەزینـەی نیزامیـە لـە پارەوپولـی ویلایەتـی موسـڵ حەواڵەکەی جێبەجێ بکرێـت و بـە ناردنی حەواڵەنامەکـەی، لـە کاتـی جێبەجـێ کردنـی هەژمارەکـەی لـە ئێسـتاوە دەسـت بـە جێبەجـێ کردنـی بکرێـت، ئـەو نـووسراوەی لـە پلەوپایـەی نەزارەتـی جەنگـی جەلیلـە نێـردراوە، جێبەجـێ کردنـی لـە سـەدارەتپەناهی لە مێـژووی ٢٥ مایس ١٣٢٤ ژمـارە ١٠١٣ بـە نـووسراوی سـەدری ئەعـزەم ئامـاژەی پێکـراوە، لـە کاتـی جێبەجـێ کردنـی مامەڵـەی پێویسـت، بـرە پـارەی ناوهاتـوو پشـت بەسـتن بـە بریارەکانـی بوودجـەی نیزامیە بـە ئەمـر و فەرمانی جەلیلـە هاوپێچ بـە ووتـەی ژمێریـاری گشـتی دارایـی راگەیەنـدراوە و ئامـاژەی پێکـراوە، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کە فەرمـان دەردەکات.<br>١٤ شەعبان ١٣٢٦ و ٢٨ ئۆغستۆس ١٣٢٤.<br>محەمەد رزا نازری دارایی</td></tr>
</table>

DH.MUİ..00001.3.00037.005

| DH.MUI. | 00001.3.00037 | 26 شەعبان 1327 |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆ

لە ١٦ ئۆغستۆس ١٣٢٥ لە بازیان ئەو دیوانی جەنگی عورفیەی دادەمەزرێت لە بارەی بردنی فەرمانبەرانی دادوەری لە خەرجی رێگا جگە لە داواکردنی رۆژانەیان ئەوا لە فەرمانی تەلەگرافنامە بۆ رۆژێکیش بێت راستگۆیی نیشان نەدراوە، بۆ ئەوەی چی بکرێت باشە ئەوا بە ووتەی داواکاری گشتی دادگای پێداچوونەوە مۆڵەت دەدرێت، فەرمان.

لە ٢٦ ئۆغستۆس ١٣٢٥
رەشید وەکیلی والی موسڵ

بۆ ئەم کارە لەگەڵ تەلەگرافنامە قسە لەسەر رۆژانەیان کراوە، لە خەزینەی جەلیلە لە بواری جێبەجێ کردن دایە، لە کاتی راگەیاندنی ئەنجامەکەی ئاماژەی پێ دەکرێت، بۆ وەڵامی تەلەگرافنامەی ناوهاتووش ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

لە ٣٠ ئۆغستۆس ١٣٢٥



DH.MUİ..00001.4.00079.014



DH.MUİ..00001.4.00079.002

| DH.MUİ. | 00001.4.00079 | 22 رەمەزان 1327 |
| --- | --- | --- |

- بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

ئەو تەلەگرافنامەی لە ٣٠ ئۆغستۆس ١٣٢٥ لەلایەن قوماندانیەتی هێزی چاودێریەوە هاتووە، ئەو نامەیەی لە فەرمانبەرانی ئێران شەهاب بەگ وەرگیراوە، بەهۆی ئەو سەرکەوتنەی لە بەدواداچووندا سەربازانی عوسمانیە بەدەستیان هێناوە پیرۆزباییان لێکراوە، لەگەڵ ئەوەش بۆ دەرهێنانی بەزۆرەملێی هەمەوەندەکان لە ئێران نووسراو بۆ دادوەری کرمانشا نووسراوە، بە دڵنیاییەوە بۆ دەرکردنی هەمەوەندەکان لە ئێران لەلایەن حکوومەتی عوسمانیە نووسراو بۆ دادوەری کرمانشا نوسراوە، بە راگەیاندنی ئەم هەواڵە جێبەجێ کردنی راگەیەندراوە، لە ١٠ ئەیلوول ١٣٢٥.

لە مزوری باڵا والی موسڵ و قوماندانی دەوروبەر فەریقی یەکەم فازڵ

- فەرمانگەی گشتی ئەرکانی جەنگی

یەکەی سێیەم

٣١٦٧

راگەیەندراوی بەندەیە

بۆ ئەوەی کاری پێویست بکرێت تا رێگە نەدرێت چەتەکانی هەمەوەند بێنە ناو خاکی عوسمانی ئامادەکاری کراوە، لەوانە بیرۆکەی ئەوەیان هەیە بەشێك بۆ موسڵ و بەشێکیشی بە مەبەستی تکاوپارانەوە بۆ شێخ عەبدولقادر گیلانی لە بەغداد برۆن، لەسەر ئاماژەی قوماندانیەتی هێزی چاودێری، دوو پارچە تەلەگرافنامەی بە شیفرە لەلایەن قوماندانیەتی لەشکری شەشەمی همایۆن پێشکەش کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٢ رەمەزان ١٣٢٧ و لە ٢٤ ئەیلوول ١٣٢٥.

نازری جەنگی




| DH.MUI. | 00003.2.000158 | 9 شەعبان 1327 |
|---|---|---|
| نەزارەتی دادوەری و مەزهەبی<br>بەڕێوەبەرایەتی تۆماری فەرمانبەران<br>ژمارە ٢٨٦<br>بۆ جەنابی نازر بەگ<br>مێژووی ٢ ئۆغستۆس ١٣٢٥ وەڵامی نووسراوی نەزارەتپەناهیە، لە قەزای بازیان ئەو دیوانی جەنگی عورفیەی ڕێکدەخرێت، ئەو فەرمانبەرانەی لەوێ دادەمەزرێن، لە بارەی خەرجی ڕێگا و ڕۆژانەی فەرمانبەرانی دادوەری لە شوێنی خۆیان سەردانەکەیان ئەنجام دەدەن، لەم بارەیەوە بۆ پەلەکردن لە مامەڵەکە پێویستی بە هاوکاری نەزارەتپەناهیە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>لە ٩ شەعبان ١٣٢٧ و لە ١٣ ئۆغستۆس ١٣٢٥<br>ڕاوێژکار بە ناوی نازری دادوەری | | |




DH.MUİ..00001.1.00084.003

<table dir="rtl">
<tr><td>DH.MUI.</td><td>00011.00084</td><td>19 شەعبان 1327</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>قەڵەمی نووسین<br>لە کەرکووك شیفرەی والی موسڵ هاتووە<br>ئەو دیوانی عورفیەی بۆ قەزای بازیان دامەزراوە، بۆ دەستبەکاربوونی سەرۆك و ئەندامەکانی ئەو دیوانی عورفیە نووسراوەتەوە، مەرکەزی بازیان کە چەمچەماڵە، لە گوندێکی بچووك پێك هاتووە، لە چەند فەرمانبەر و چەند خانەیەکی هەژاران پێك هاتووە، هەرچی هەمەوەندەکانە بە سنوور بەزاندنیان لە ناو ئێران بوونیان هەیە، ئەوانەی پەیوەندیان بە ئەوانەوە هەیە لە ئێستاوە ٥٠ کەس دەست بەسەر کراوە بۆ پاراستنی ئەو تاوانبارانە گرتووخانەیەکی تایبەت نییە، قشلە و شوێنی میری بە گشتی بوونیان نییە، کەسیش ئاگاداری ئەو کارە نییە، ئەوەی پەیوەستە بە کاری هەمەوەندەکان، بۆ دەستەی عورفیە قەزاکە ١٢ کاتژمێر لە سانجەقی سلێمانیە دوورە، ٨ کاتژمێریش لە کەرکووك دوورە، بۆیە لە هەر ئەگەرێك بانگ کردنی دەستەی ناوهاتوو و تاوانبارەکان بۆ ئێرە بە سوود تر دەبێت، بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانە، لە ١٣ ئۆغستۆس ١٣٢٥ لە ١٥ هاتووە.<br>فەریق فازڵ والی و قوماندانی یەکەم</td></tr>
</table>


مجلس وکلاده مذاکره سنه مخصوص ضبط ورقه سیدر

حاضر بولنان ذوات فخامت آیاتی

خلاصهٔ مآلی

قرار

| MV. | 00131.00086 | 16 شەعبان 1327 |
|---|---|---|

١٦ شەعبان ١٣٢٧
١٩ ئۆغستۆس ١٣٢٥
پوختەی دارایی
ڕێکخستنی بازیان کراوەتە ڕاپۆرت، ئەگەرچی دیوانی جەنگی عورفی لە جێبەجێ کردنی ئەرکەکە داوەت کراون، مەرکەزی بازیانیش لە گوندێکی بچووك پێکهاتووە، تاوەکو ئێستا نزیکەی ٥٠ تاوانبار دەستگیر و دەستبەسەرکراون، بۆ پاراستنی ئەوانە گرتووخانە هەبێت و بۆ سەربازی ئامادەبووش قشلەیەك هەبێت و لەگەڵ شوێنی میری بوونی هەبێت، بۆ ئەم مەبەستەش دەستەی دیوانی جەنگی بۆ سانجەقەکانی سلێمانیە یاخود کەرکووك بگوازرێتەوە هەروەها تاوانبارانی ناوهاتوو ببردرێنە ئەوێ و دەست بەسەر بکرێن، بۆ ئەم کارەش ڕەزامەندی نیشان دراوە، لەلایەن پاشای والی موسڵ ڕاگەیەندراوە، بۆ ڕەزامەندیش لە نەزارەتی ناوەخۆ لە مێژووی ١٣ شەعبان ١٣٢٧ ژمارە ٢٣٠٨ نووسراو خوێندراوەتەوە.

بریار
بە تێروانین لە وێنەی ڕاگەیەندراوی ناوهاتوو دیوانی جەنگی لە گوندی باسکراو بهێڵدرێتەوە، ئەوا گونجاو نییە و بەرژەوەندی تێدا نییە، بە گوێرەی ئاماژە پێکردنێکەوە دەستەی دیوانی جەنگی بگوازرێتەوە سلێمانیە هەروەها دەستبەسەرەکانیش بگوازرێنەوە ئەوێ، جێبەجێ کردنی ئەم مامەڵەیە لە نەزارەتەکانی جەنگی و ناوەخۆ نووسراوی بۆ کراوە.




<table>
<tr><td>2 موحەرڕەم 1327</td><td>02717.00080</td><td>DH.MKT.</td></tr>
<tr><td colspan="3">٢ موحەرڕەم ١٣٢٧<br>١٢ کانوونی دووەم ١٣٢٤<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>دەرویش ئەفەندی کاتیبی ناسنامەی قەزای بازیان لە ئەرکی کاتیبی ناوهاتوو بەپەلە ئاماژە بە مێژووی دەست بە کار بوونی بکرێت، بە ووتەی یەکەی تۆمار رادەگەیەندرێت.</td></tr>
</table>




DH.MKT.02796.00071.001

| | | |
|---|---|---|
| DH.MKT. | 02796.00071 | 20 رەبیعی یەکەم 1327 |

سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی نێردراوان

ژمارە ٨٢٤

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

قەسەبەی چەمچەماڵ کە مەرکەزەکەی قەزای بازیانە، لە زۆر شوێنی گرنگی سەربازی و شوێنی هاتن و ڕۆیشتنی زۆر لە هۆزەکان و تێپەربوونی کاروانە بازرگانیەکانە، بۆیە بۆ لایەنی سەربازی و کارگێری حکوومەت فەرمانگەیەکی فەرمی و یەك قشلە هەبێت، ئەوانە دامەزرێن و جگە لەوەش گوندەکانی سەر بە ناوچەکە بۆ هەر یەکەیان مەکتەبێکی سەرەتایی بونیاد بنرێت و هەرچی زووە بە پەلەش چەتەکانی هەمەوەند لەم ناوچەیە تەمبێ بکرێن و دوور بخرێنەوە، بۆ ئەم کارەش وەکیلی قائیمقامی قەزای ناوهاتوو ئاغای تابور محەمەد ساڵح و قوماندانی مەفرەزەی سوارەی ئێستر یوزباشی ئیبراهیم ئەدهەم کاغەزی بە مۆریان هاتووە و لە ئەنجوومەنی ناوەخۆ بریار دراوە بۆ نەزارەتی جەلیلە بنێردرێت، هەروەها کاغەزی ناوهاتوو هاوپێچ پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

لە ٢٠ رەبیعی یەکەم ١٣٢٧ و لە ٢٩ مارت ١٣٢٥

ئەحمەد رزا سەرۆکی ئەنجوومەنی نێردراوان



DH.MKT.02888.00083.003

| 11 ڕەجەب 1327 | 02888.00083 | **DH.MKT.** |
| --- | --- | --- |

نەزارەتی جەنگی
فەرمانگەکانی دادگایی
٢٢٩
بۆ لایەنی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلەی پایەبەرز
پوختە: لە قەزای بازیان دیوانی جەنگی عورفی دادەمەزرێت

ڕاگەیەندراوی بەندەیە
ئەو دیوانی جەنگی عورفیەی لە قەزای بازیان دادەمەزرێت، لە چەند ئەندامی چوارینە پێك دێت، هەروەها لە ئەمەدا لەلایەنی دادوەری ئەندام دەدۆزرێتەوە یا نادۆزرێتەوە لە ویلایەتی موسڵ بۆ لایەنی سەرووی نەزارەتپەناهی نێردراوە، بە هاوپێچ ئەو دوو پارچە تەلەگرافنامەیەی بۆ لایەنی عاجیزانە نێردراوە، بۆ پرس و ڕاو چۆنیەتی کارەکەش نووسراو بۆ قوماندانیەتی لەشکری شەشەمی هومایۆن کراوە، لەگەڵ دیوانی جەنگی ناوهاتوو، بە سەرۆکایەتی میری ئاڵا ئەنیس بەگ لە قوماندانی لیوای ١٨ ی سوارە لە موسڵ بە ئەندامیەتی قائیمقام و بینباشی و پلەی مادونی واتە شەش کەس دادەمەزرێت، لەم بارەیەوە لێکۆڵینەوەی سەرەتایی و مامەڵەی لێپرسینەوە جێبەجێ دەکرێت، هەروەها سێیان لە فەرمانبەرانی دادوەری و سێیان لە ئەفسەری سەربازی دەبێت، شەش کەس یەك دەستەی لێکۆڵینەوە بە هەڵبژاردن بە هاوکاری دیوانی جەنگی ناوهاتوو ئامادە دەبن، بە وەڵام بۆ قوماندانیەتی ناوهاتوو ئاگاداری نێردراوە، هەروەها لە تەلەگرافنامەکانی باسکراو هاوپێچ پێشکەش کراوە و دووبارە کراوەتەوە، ئەوەی پێویستە لەلایەنی نەزارەتپەناهی ئاگاداری دەنێردرێت و جێبەجێ دەکرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ١١ ڕەجەب ١٣٢٧ و لە ١٥ تەمموز ١٣٢٥
نازری جەنگی




| DH.MKT. | 02891.00043 | 16 رەجەب 1327 |
|---|---|---|

نەزارەتی کاروباری ناوەخۆ
دیوانی گشتی ژمێریاری
١٠١٧
لەلایەن نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە بۆ لایەنی سەروو
ماوەیەکە هـۆزی هەمەوەنـد یاخـی بوونـی خۆیـان ڕاگەیانـدووە، بـۆ تەمبـێ کـردن و دوورخسـتنەوەیان سـەربازی شـاهانە ڕەوانـەی چەمچەمـاڵ کـراوە و لـەوێ کۆبوونەتـەوە، لـەو دەوروبـەرە زیاتـر لـە مانگێکـە قـوم مەملەحـە لـە پاراسـتنی سـەربازی بـێ بـەش بوونـە، بەمـەش کەوتوونەتـە ژێـر مەترسـییەکی گـەورە، هەروەهـا بـۆ نیشـتەجێ کردنـی ئەندامەکانـی هـۆزی ناوهاتـوو، هـەر چەنـدە لەلایـەن سەرپەرشـتیاری دیوانـی گشـتی زیـاد لـە پێویسـت هـەوڵ و کۆششـیان داوە، بـەڵام ئـەو سـەربازانەی نێردراونەتـە چەمچەمـاڵ کۆبوونەتـەوە، ئەوانەیـان شکسـت پێهێنـاوە، سەرپەرشـتیار و فەرمانبەرانـی مەملەحـە و هەروەهـا بـۆ ڕزگارکردنـی ژیانـی بەکاربـەران بـۆ چەمچەمـاڵ ڕایانکـردووە، جگـە لەمـە لـە مەملەحـەی ناوهاتـوو سـاڵانە نزیکـەی ٥٠٠ تـۆن خـوێ بەدەسـت دەهێنرێـت، لـەم سـاڵەدا ئـەو بـرە بـۆ ٨٠٠ تـۆن زیاتـر بەدەسـت دەهێنرێـت، هەروەهـا بـەم شـێوەیە بـروات مەملەحـە بەجـێ دەهێڵـن، بـەم شـێوەیەش ئـەو بـرە خوێیـە لەناودەچێـت و دەفەوتێـت، بـەم هۆیـەوە لـەم دەوروبـەرە قاچاغچـی زیاتـر دەبێـت، بۆیـە سـەردانی نەزارەتـی جەلیلـە کـراوە، لەگـەڵ پاراسـتنی ژیانـی فەرمانبـەران و بەکاربەران، یاسـای خەزینـە خراوەتـە ژێـر دڵنیابـوون، لـە ئەنجوومەنـی کارگێریـش بـاس کـراوە، ئەمجـارە لـە دیوانی گشـتی قۆمیسـیۆن نـووسراو وەرگێـراوە، لـەم بارەیـەوە لـە قۆمیسـیۆنی ناوهاتـوو پێشـەکی نـووسراو لە ٩ تەممـوز ١٣٢٥ لە قۆمیسـیۆنی ناوهاتـوو هاتـووە، لـە ١٦ تەممـوزی ١٣٢٥ بـە نەزارەتـی جەنگـی جەلیلـە ڕاگەیەنـدراوە، بـە گوێـرەی پێداچوونـەوە بەپەلـە جێبەجـێ بکرێـت و لـە ئەنجامەکـەی زانیـاری بدرێـت، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ١٦ ڕەجـەب ١٣٢٧ و لـە ٢٠ تەممـوز ١٣٢٥.
ڕاوێژکار بە ناوی نازری دارایی




DH.MKT.02892.00050.001

| DH.MKT. | 02892.00050 | 18 رەجەب 1327 |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

مێـژووی ١٨ تەممـوز ١٣٢٥ هاوپێچـی تەلەگرافنامـەی بەندەمانـە، ئـەو فەرمانبـەرە سـەربازانەی بـۆ چاودێـری کردنـی هەمەوەنـدەکان کار دەکـەن یـەك تابـور ئـەرزاق و ئامـادەکاری لـە کەرکـوك بەجێهێڵـدراوە، ئـەو هێـزەی ماوەتـەوەش گەیشـتوونەتە چەمچەمـاڵ، ئـەو قەڵایـەی هەمەوەنـدەکان کـە دەکەوێتـە گونـدی موزەفەریـە خاڵـی بـووە و لەلایـەن سـەربازەکانەوە دەسـتی بەسـەر داگیـراوە، هەروەهـا لەبـەر ژەهـراوی بـوون ٨ کـەس مـردوون، ئەمـەش لەلایـەن قوماندانـی هێـزی چاودێـری میـری ئـاڵای مەزهـەر بـەگ راگەیەنـدراوە.

٢١ تەمموز ١٣٢٥

رەشید والی موسڵ



| DH.MKT. | 02900.00092 | 28 ڕەجەب 1327 |
| --- | --- | --- |

٢٨ ڕەجەب ١٣٢٧
٢ ئۆغستۆس ١٣٢٥
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
دیوانی جەنگی عورفی لە قەزای بازیان ڕێکخستنی بۆ دەکرێت، لەلایەن دادوەری فەرمانبەر دادەنرێت و لە نەزارەتی دادوەری جەلیلە راگەیەندراوە، سەرۆکی سزای سانجەقی سلێمانیە رفعەت و یاریدەدەری داواکاری گشتی کەرکوك، شەریف و ئەندامی دادگای پێداچوونەوەی ویلایەت، حامد ئەفەندی دانراون، لە بارەی مووچەکانیان و خەرجی ڕێگا ڕۆژانە هەر یەکە ١٠٠ قوروشیان پێ دەدرێت، لە بارەی سەنەدەکانیش لەم ساڵەوە لە داهاتی خۆچێی لە خەرجی چاوەڕێنەکراو ڕێك دەخرێت، هەروەها لە کاتی یارمەتی نەدانیش هەموو ڕێکخراوەکان مامەڵەکان هەژمار کراوە، لە بارەی جێبەجێ کردنی بە ووتەی ژمێریاری راگەیەندراوە و مۆڵەتی پێ دراوە.

بۆ نەزارەتی دادوەری جەلیلە
نووسراوی مێژووی ١ ئۆغستۆس ١٣٢٥ ژمارە ٢٦٣ وەڵامی سەرووە، لە سەر فەرمانی دامەزراندنی دیوانی جەنگی عورفیە لە قەزای بازیان، ئەو ناوانەی لە فەرمانبەرانی دادوەری کە ناویان هاتووە، بۆ ڕێکخستنی خەرجی ڕێگا و ڕۆژانەیان لەلایەن سەدارەتپەناهی مۆڵەتی پێدراوە، لە کاتی هاتنی وەڵامەکە، بۆ مامەڵەی پێویست ئێستا لە ناردنی زانیاری بۆ نەزارەتی جەلیلە بە ئاسایی بینراوە.



| DH.MKT. | 02901.00008 | 28 ره‌جه‌ب 1327 |
|---|---|---|

٢٨ ره‌جه‌ب ١٣٢٧
٢ ئۆغستۆس ١٣٢٥
نه‌زاره‌تی دادوه‌ری جه‌لیله

وه‌ڵامی نووسراوی مێژووی ٣٠ ته‌مموز ١٣٢٥ ژماره‌ ٢٥٥، ئه‌و دیوانی جه‌نگیه‌ی كه‌ له‌ قه‌زای بازیان داده‌مه‌زرێت، له‌ ژێر سه‌رۆكایه‌تی قوماندانی سواره‌ی لیوا، ئالای میر ئه‌نیس به‌گ به‌ بوونی شه‌ش كه‌س رێكخراوه‌، له‌ جێبه‌جێ كردنی لێكۆڵینه‌وه‌ی سه‌ره‌تای و مامه‌ڵه‌ی وه‌ڵامدانه‌وه‌دا، سێیانیان له‌ فه‌رمانبه‌رانی دادوه‌ری و سێیه‌كه‌ی تریش له‌ ئه‌فسه‌ری سه‌ربازی پێك هاتوون، به‌مه‌ش له‌ شه‌ش ئه‌ندام ده‌سته‌یه‌كی لێكۆڵینه‌وه‌ پێك هاتووه‌، دیوانی جه‌نگی ناوهاتووش له‌گه‌ڵی ده‌بێت، ئه‌مه‌ش به‌ قوماندانیه‌تی له‌شكری شه‌شه‌م راگه‌یه‌ندراوه‌، بۆ نه‌زاره‌تی جه‌نگیش نووسراو نێردراوه‌، سه‌باره‌ت به‌ جێبه‌جێ كردنیشی له‌ نه‌زاره‌ت به‌ نووسراوی مێژووی ١٩ ته‌مموز ١٣٢٥ ئاماژه‌ی پێكراوه‌، به‌ ووردبینی ده‌ركه‌وتووه‌.



| 29 رەجەب 1327 | 02901.00093 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٩ رەجەب ١٣٢٧
٣ ئۆغستۆس ١٣٢٥
بۆ نەزارەتی دارایی
٢٠ تەممـوز ١٣٢٥ ژمـارە ١٠١٧ وەڵامـی نـووسراوی سـەرووە، بـۆ دوورخسـتنەوەی چەتەکانـی هـۆزی هەمەوەنـد ئـەو هێـزە سـەربازیەی دەرچـووە، لـە چەمچەمـاڵ کۆبوونەتـەوە، بـۆ شکسـت پـێ هێنانـی ناوهاتـوو فەرمانبەرانـی مەملەحــە و بەکاربــەران دووچــاری مەترســی بوونەتــەوە، بــۆ پاراســتنی ژیانیــان لەگــەڵ پاراســتنی مەملەحــە پێویسـتە، ئەمـەش بـۆ ویلایەتـی موسـڵ نووسراوەتـەوە، بـە تەلەگرافنامـە وەڵامەکـەی هاتـووە لـە بـارەی فەرمانـی پاراسـتنەکە تابـوری سـێیەم لـە مەملەحـە نیشـتەجێ کـراوە، هەروەهـا سەرپەرشـتیاریش لـە تەممـوزی رۆژی ٢٣ گەراوەتـەوە، لەسـەر ئاماژەی قوماندانیەتـی هێـزی بەدواداچـوون بـە میهرەبانیـەوە نـووسراو نووسراوەتـەوە بەرێزم.



| DH.MKT. | 02913.00019 | 12 شەعبان 1327 |
|---|---|---|
| ١٦ ئۆغستۆس ١٣٢٥<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>لە ٩ ئۆغستۆس ١٣٢٥ بۆ بەستنەوەی مووچە راستەقینەکەی ئەندامانی دەستەی لێکۆڵینەوەی بازیان لەگەڵ کاتژمێری زیادە هەژمار دەکرێت، خەرجی رێگاش لە ناو موازەنەکەدا دەبێت، پێویستە خەرجی رێگا رێك بخرێت و بۆیان خەرج بکرێت. | | |


T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
3624 | 271799 | 2

BEO.003624.271799.002

| BEO. | 003624.271799 | 28 رەجەب 1327 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ٢١١٨
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
راگەیەندراوی بەندەتانە
ئەو دیوانی جەنگی عورفیەی کە لە قەزای بازیان دادەمەزرێت، ئەو فەرمانبەرانەی لەلایەن دادوەریەوە دادەنرێن، بە نەزارەتی دادوەری جەلیلە ووتراوە، لە سانجەقی سلێمانیە سەرۆکی سزا رەفعەت و یاریدەدەری داواکاری گشتی شەریفە لە کەرکوك هەروەها ئەندامی دادگای ئیستیناف (استیناف)ی ویلایەت حامد ئەفەندی، سەبارەت بە برینەوەی مووچە بۆیان، خەرجی رێگا و رۆژانە هەر یەکە ١٠٠ قوروشیان بۆ براوەتەوە، لەم ساڵەوە لە داهاتی خۆچێی لە رێکخستنی خەرجی پێویست رێکخراوە، هەروەها لە راپۆرتی هاوکاری بۆ جێبەجێ کردنی مامەڵەی هەژماردن بە ووتەی ژمێریاری راگەیەندراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٨ رەجەب ١٣٢٧ و لە ٢ ئۆغستۆس ١٣٢٥.
نازری ناوەخۆ



DH.MUI..00061.1.00006.002

| DH.MUI. | 00061.1.00006 | 17 موحەررەم 1328 |
|---|---|---|

فەرمانگەی گشتی ئەرکانی جەنگی
یەکەی سێیەم
٤٦٧٤
پوختە: ئەو کەسانەی کە دیوانی جەنگی عورفی سلێمانیە داوایان دەکات ئەوانیش عەبدولقادر و هاوەڵانی بووە، ئەگەرچی رووبەڕووبوونەوە روویداوە، بەڵام دەستگیر نەکراوە.

بۆ نەزارەتی  ناوەخۆی جەلیلە
بۆ جەنابی دەوڵەت
ئەو کەسانەی کە دیوانی جەنگی عورفی سلێمانیە داوایان دەکات ئەوانیش عەبدولقادر و هاوەڵانی بووە، لە ناو قەزای بازیان لە ناحیەی قەرەداغ، لەگەڵ ئاغای دەوریەی قول مەحمود ئەفەندی بە قوماندانیەتی ئەو مەفرەزەی ئێستر سوارە بە رێکەت رووبەرووی یەکتر بوونەوتەوە و لە کاتی رووبەڕووبوونەوەکە هەڵاتووە، لەوانە هەندێکیان رادەستی خۆچێی کراون، هەروەها ئەو سەربازانەی لە رووداوەکە هیچیان بەسەر نەهاتووە، لەسەر ئاماژەی قوماندانیەتی هێزی چاودێری بەوەکالەتی قوماندانیەتی لەشکری شەشەم لە تەلەگرافنامەی مێژووی ١١ کانوونی دووەم ١٣٢٥ هاتووە و ئاماژەی پێکراوە، بە توندی چاودێری بکرێن، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
١٧ موحەررەم ١٣٢٨ و ١٦ کانوونی دووەم ١٣٢٥
بە ناوی نازری جەنگی



DH.MUİ..00119.00023.002

| | | |
|---|---|---|
| 26 رەجەب 1328 | 00119.00023 | DH.MUI. |

نەزارەتی جەنگی
فەرمانگەی‌دادگاییەکان
٣٢٣
پوختە: بوێری کراوە کاری کوشتن بکات، بۆیە شەریف کوڕی مەعروف بە ١٠ ساڵ بە سزای سەوڵ لێدان سزا دراوە، لەم بارەیەوە فەرمانی پاشای لەسەر دەرچووە

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
بۆ جەنابی دەوڵەت
لە چەتەکانی هەمەوەند شەریف کوڕی مەعروف لە رووداوی دەربەند لەگەڵ یەك بینباشی و دوو سەربازی کوشتووە، هەروەها چەکێکی زۆر و کەلوپەلی تاڵان کردووە، جگە لەمە لە ٥ حوزەیران ١٣٢٥ ئەو تاوانانەی لەلایەن هەمەوەندەکان ئەنجام دراوە، لە کاتی دادگاییکردنیدا پەسەند کراوە، بە یاسای سزای مولکیە پشت بەستن بە دەستەواژەی کۆتایی ماددەی ٦٢، بڕیار دراوە بە ١٠ ساڵ سەوڵ لێدان زیندانی بکرێت، لە دیوانی جەنگی عورفی بازیان رێکخراوە، هەروەها بە قوماندانیەتی لەشکری شەشەمی هومایۆن نووسراو کراوە و بە هاوپێچی بڕیارنامە راگەیەندراوە، بە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا لە مێژووی ٨ تەمموز ١٣٢٦ نووسراوی سەدری ئەعزەم نووسراوەتەوە و نێردراوە، هەروەها بۆ جێبەجێ کردنی بە پارچەیەك ئەمر و فەرمانی هومایۆن بە تەلەگراف بە قوماندانیەتی ناوهاتوو راگەیەندراوە، بە گوێرەی ئەوە بە ووتەی فەرمانگەی دادگاییکردن جێبەجێ دەکرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، ٢٦ رەجەب ١٣٢٨ و ٢٠ تەمموز ١٣٢٦.

به ناوی نازری جەنگی




ML.EEM.00845.00007.009

| ML.EEM. | 00845.00007 | 22 ڕەمەزان 1328 |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی نووسین
٥٩
نەزارەتی دارایی جەلیلە
پێویستە لە مەرکەزی بازیان قۆناغێکی حکوومەت بونیاد بنرێت
بۆ جەنابی ئەفەندم

لـە مەرکـەزی قـەزای بازیـان بە خەرجـی ٥٦١٤٥ قـوروش دووبارە قۆناغێکی حکوومەت لە موتەسـەرفیەتی سـلێمانیە ئامـاژەی پێکـراوە، هەروەهـا لـەم بارەیـەوە کاغەزەکانـی دەرخسـتن پێشـکەش کـراوە، بـە خـەرج کردنـی بـرە پـارەی باسـکراو بە ناوی دروسـت کردنی قۆناغی حکوومەت داوای مۆڵەتی کراوە، بە بڕیاری ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەت ڕاگەیەندراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٢ ڕەمەزان ١٣٢٨ و لە ١٣ ئەیلوول ١٣٢٦.
میری لیوا وەکیلی والی موسڵ


İ.DH.1479/1328.M/13

İ.DH.001479

| I.DH. | 01479.000013 | 10 موحەررەم 1328 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی تۆماری فەرمانبەران
ژمارە ٣٦٣٧
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی

لە ناو ویلایەتی موسڵ بۆ قائیمقامیەتی بازیان ساڵح رەحمی ئەفەندی دامەزراوە، بەڵام دەرکەوتووە بۆ شوێنی کارەکەی ناروات، بەڵام بۆ قائیمقامیەتی قەزای ناوبراو رەسول ئەفەندی بەڕێوەبەری ناحیەی مەرگە کە بۆ چاودێری کردنی چەتەکان کارێکی باشی کردووە و کارەکانی بینراوە، ناوبراو کارەکەی پێبدرێت، بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارە لەسەر ئاماژەی ویلایەت هەروەها بڕیاری ئەنجوومەنی هەڵبژاردن دیاری کراوە، بۆ جێبەجێ کردنیش هاوکاری وەکالەتپەناهی پێویستە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

١٠ موحەررەم ١٣٢٨ و ٩ کانوونی دووەم ١٣٢٥
ڕاوێژکار بە ناوی نازری ناوەخۆ



| 20 زیلقەعدە 1328 | 01485.000007 | I.DH. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
ئەنجوومەنی بریکارەکان و راگەیەندراوەکان
٣٤٨٥
جەنابی ئەفەندم
لە ناو ویلایەتی ئەنقەرە قائیمقامی قەزای تیکوەش حوسنی بەگ گواستراوەتەوە، هەروەها بۆ قەزای تیکوەش، ساڵح رەحمی ئەفەندی کە لە قائیمقامیەتی بازیان جیابۆتەوە، لە بارەی دامەزراندنی نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە پێشکەش کراوە و راگەیەندراوە، ئەگەر فەرمانی پاشای جەنابی پاشا بفەرمووێت ئەوا جێبەجێ دەکرێت.

٢٠ زیلقەعدە ١٣٢٨ و ٩ تشرینی دووەم ١٣٢٦
سەدری ئەعزەم




<table>
<tr><td>BEO.</td><td>003632.272345</td><td>16 شەعبان 1327</td></tr>
<tr><td colspan="3">
بابی عالی<br>
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ<br>
قەڵەمی نووسین<br>
ژمارە ٢٣٤٨<br>
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی<br>
راگەیەندراوی بەندەیە<br>
هاوپێچی نووسراوی ١٦ ئۆغستۆس ١٣٢٥، لە عەقرە لەسەر کاری سەرپێچی و جموجۆڵی چەتەگەریان بە توندوتیژی لێدراون و دوورخراونەتەوە، لەوێ بەپەلە کارگێریەکی عورفی رابگەیەندرێت، بە خێرایی گەندەڵی لەناوبربردرێت و ئەوانەی هۆکاری ئەو کارانەن تاوانەکانیان بەسەر ساغ بکرێتەوە و سزا بدرێن، بۆ ئەمەش دەبێت کارگێری عورفی لە عەقرە و دەورووبەری رابگەیەندرێت، هەروەها ئەو دیوانی عورفی جەنگیەی بۆ قەزای بازیان دادەمەزرێت، بۆ هەردوو لا گشتگیر بێت، بە گوێرەی عەقرە و بازیان لە ناوەراست دەبێت، هەروەها فرقەی نیزامیە مەرکەزەکەی لە کەرکوك بێت، بە گوێرەی بارودۆخ و بەرژەوەندی گونجاو بێت، ئەمجارە لە ویلایەتی موسڵ تەلەگرافنامە وەرگیراوە و پێشکەش کراوە، بۆ ناردنیشی بە تێروانین لە راگەیاندن و ئاماژەپێکردن چۆنیەتی مۆڵەتەکەی پەلەی لێکراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٦ شەعبان ١٣٢٧ و لە ١٩ ئۆغستۆس ١٣٢٥.<br>
نازری ناوەخۆ
</td></tr>
</table>

| | | |
|---|---|---|
| BEO. | 003693.276961 | 14 موحەررەم 1328 |

١٤ موحەررەم ١٣٢٨
١٣ کانوونی دووەم ١٣٢٥
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لە ناو ویلایەتی موسڵ بۆ قائیمقامیەتی قەزای بازیان لەسەر ئاماژەی ویلایەت رەسول ئەفەندی بەڕێوەبەری ناحیەی مەرگە، لەسەر نووسراوی دەوڵەت لە مێژووی ٩ کانوونی دووەم ١٣٢٥ ژمارە ٣٦٣٧ بە رەزامەندی فەرمانی پاشای جەنابی پاشا لە مێژووی ١٢ کانوونی دووەمی هەمان ساڵ فەرمانی داوە، هیممەت بکرێت بۆ جێبەجێ کردنی.

| | | |
|---|---|---|
| BEO. | 003721.279023 | 8 ڕەبیعی یەکەم 1328 |

٨ ڕەبیعی یەکەم ١٣٢٨
٧ مارت ١٣٢٦
نەزارەتی دارایی جەلیلە
قەبوڵ کردنی ملکەچ بوونی هەمەوەندەکان بۆ مەملەکەت دەبێتە زیان، بۆ هەموان بە واژووی شێخی قادریە عەلی و هاوەڵانی لە مەرکەزی کەرکووک تەلەگرافنامە ڕاکێشراوە، دانەیەکی لەم تەلەگرافنامانە بردراون، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکەش وەکالەتی قوماندانیەتی لەشکری شەشەم ئاگادار کراوەتەوە، لە وەڵامدا بە گوێرەی پێداچوونەوەی ڕووداوەکە و لیستی هەژمارەکان زانیاری ڕاستەقینە دراوە، دوای کوشتنی شێخ سەعید لە موسڵ، هەروەها لە ساڵی ١٣٢٤ شوبات بۆ تۆڵەسەندنەوە ئامادەکاری کراوە، هەروەها لە چەمچەماڵ سێ پارچە تەلەگرافنامە ڕاکێشراوە، لەگەڵ ئەو پارچە تەلەگرافنامانە لەلایەن ناوبراو عەلی و هاوەڵانی نێردراون، قوماندانیەتی هێزی چاودێری ئاگادار کراوەتەوە کە لەسەر ئەوە ماوەتەوە دانەیەك لەو تەلەگرافنامە باسکراوانە بدرێتە قوماندانیەتی هێزی چاودێری، لەم بارەیەوە بە ووتەی تەلەگرافخانە هاتووە تا فەرمان لە بابی عالیەوە نەیەت دانەیەك لەم تەلەگرافنامەیەی پێ نادرێت، دوای ناردنی نووسراو ئەو سێ پارچە تەلەگرافنامەیەی کە لە چەمچەماڵ دەرچووە، پێویستە وێنەیەکیان بدرێتە قوماندانیەتی هێزی ناوهاتوو، بە گوێرەی هەندێك ووتە لە نەزارەتی جەنگی جەلیلە نووسراو هاتووە لە ٤ مارت ١٣٢٦ ژمارە ٥١ بۆ سەروو نێردراوە، بە پشت بەستن بەمە ئاگاداری پێویست دراوەتە بەڕێوەبەرایەتی گشتی تەلەگراف و تەلەفۆن کە هیممەت بکرێت.

| DH.MB.HPS. | 00034.00040 | 25 زیلقەعدە 1329 |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی جەلیلە
٤ تشرینی دووەم ١٣٢٧
قەزای چەمچەماڵ بەهۆی گرنگی شوێنەکەی ئەو شوێنەی کە بۆ گرتووخانە دەست نیشان کراوە، وێران و کۆنە، بۆیە لەوێ قۆناغێکی حکوومەت کە لە شان و شەوکەتی حکوومەت بوەشێتەوە دروست بکرێت، لەگەڵ ئەویش گرتووخانەیەك دروست بکرێت، سەرپەرشتیاری فەرمانبەران کە چۆتە ئەوێ و گەراوەتەوە، بە راپۆرتێك باسی کردووە، لە قەزای ناوبراو پێویستە گرتووخانە دروست بکرێت، بە گوێرەی ئاگادارکردنەوەی گشتی لە مێژووی ٣ مارت ١٣٢٧ کاغەزی دەرخستنی بە رێکخراوی نێردراوە.

| 29 شەعبان 1329 | 00882.00018 | ML.EEM. |
|---|---|---|

- لە نەزارەتی دادوەری جەلیلە بۆ لایەنی سەدری ئەعزەم
٢٠٤
راگەیەندراوی بەندەیە
لەگەڵ ئەوەی مۆڵەت دراوە کە دادگای سەرەتایی و فەرمانگەی دادوەری قەزای بازیان مانگانە بە ٥٠ قوروش خانە بە کرێ بگرێت، بەڵام خانە نەدۆزراوەتەوە، بۆیە بە ٢٥٠٠ قوروش خانەی کاتیبی نووسراوەکان مەجید ئەفەندی بۆ فەرمانگەی دادوەری بە ناوی حکوومەت بکردرێت، هەروەها بڕە پارەی ناوهاتوو بە پارەی کرێی دابینکراو خانەی ناوهاتوو دەکردرێت و لە بارەی بەناو کردنی راگەیاندن و ئاماژە پێکردنی مامەڵەکە لە دادگای ناوهاتوو بە نوسراوەکانی لە ئەنجوومەنی دادوەری لە ٤ ئۆغستۆس ١٣٢٧ بریار دراوەتە سەدری ئەعزەم لە سەدارەتپەناهی، دوای پێشکەش کردن و راگەیاندنی بۆ جێبەجێ کردنی ئەمر و فەرمانی جەلیلەی پێویستە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٢٩ شەعبان ١٣٢٩ و لە ١١ ئۆغستۆس ١٣٢٧
نوری مستەفا داواکاری گشتی دادگای سەرەتایی موسڵ

- بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
یەکەی ژمێریاری ویلایەت
ژمارە ١٦٣٥
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
بۆ جەنابی ئەفەندم
لە ویلایەتی موسڵ سانجەقی سلێمانیە لە هۆزە ناودارەکان هۆزی هەمەوەند بازیان و چەمچەماڵ بۆتە شوێنی هاتووچۆکردنی ئەم هۆزە، بۆ نیشتەجێ کردنی فەرمانبەران قۆناغێکی تایبەت بە حکوومەت نەدۆزراوەتەوە تا ئەوانە تێدا نیشتەجێ بن، بە ناچاری خانەکانی خۆیان و لە فەرمانگەکانی سەلاملك ئەرکەکانیان جێبەجێ دەکەن، ئەم کارەش لە شان و شەوکەتی حکوومەت کەم دەکاتەوە، پێویستە پەلە بکرێت لە دروست کردنی قۆناغێکی حکوومەت، بۆ ئەم مەبەستەش سەرپەرشتیاری مولکیە عەلی سەیدی بەگ نێردراوە و دوای ئامادەکردنی راپۆرتێك لەم بارەیەوە پێشکەشی کردووە لەگەڵ راپۆرتی دەستەی سەرپەرشتیاران لە رووی داراییی دەرکەوتووە لە راستییدا بە هەموو شێوەیەك شیاو نییە فەرمانبەران لەو خانانەی کە باسکراوە مامەڵەکان جێبەجێ بکەن، بۆیە نەزارەتی جەلیلە خەرجی دروست کردنی خانە دابین دەکات، بۆیە سەبارەت بە دروست کردنی قۆناغێکی حکوومەت نەزارەتپەناهی داوای کردووە هیممەت بکرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٦ زیلقەعدە ١٣٢٩ و لە تشرینی دووەم ١٣٢٧.
راوێژکار بە ناوی نازری ناوەخۆ


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
3888 | 291533 | 3

BEO.003888.291533.003

| BEO. | 003888.291533 | 25 رەبیعی کۆتایی 1329 |
|---|---|---|

نەزارەتی دارایی
بەڕێوەبەرایەتی گشتی داهات
یەکەی چوارەم
٢٥٩٥ گشتی
٦١ تایبەتی
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
پوختە: لە نێوان کەرکووك و سلێمانیە دامەزراندنی شۆفێری بە کەفیل.

ڕاگەیەندراوی بەندەیە
لە نێوان کەرکووك و سلێمانیە بۆ ئەوەی کاری پۆستە بە ڕێکوپێکی بەڕێوەبچێت، لە دەستەی گشتی ئەنجوومەنی نێردراوان بڕیار دراوە، لەسەر بڕیارنامەی سەروو کە لە مێژووی ١٥ مایس ١٣٢٦ ژمارە ٤٦٥ بە بڕیارنامە هاتووە، لە وەڵامی ئەو ئاماژە پێکردن و ڕاگەیەندراوەی کە پێشووتر هاتووە لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی پۆستە و تەلەگراف و تەلەفۆن نووسراوە بەدەست گەیشتووە، لە نێوان کەرکووك و چەمچەماڵ و سلێمانیە شۆفێرێکی بە کەفیل دابنرێت، ئەمجارەش لە مەرکەزەکانی سلێمانیە و چەمچەماڵ پاکێتی پۆستەی ناوخۆ هەروەها مامەڵەی نامەی بە بەها و بە نرخ جێبەجێ بکرێت، ئەوانەی کە کارەکە جێبەجێ دەکەن، چۆنیەتی کارەکەیان پێ ڕابگەیەندرێت، هەروەها مێژووی مامەڵەی نێردراوی دەست بەکار بوو ئاماژەی پێ بکرێت و ڕابگەیەندرێت، هەروەها لە سەرۆکایەتی جەلیلەی ئەنجوومەنی نێردراوان نووسراوی هاوپێچ بۆ پێشەوای سەروو پێشکەش کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٢٥ ڕەبیعی کۆتایی ١٣٢٩ و لە ١٢ نیسان ١٣٢٧
ڕاوێژکار بە ناوی نازری دارایی




| 9 رەبیعی یەکەم 1330 | 00122.00013 | DH.ID. |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ١٩٠
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
پاشکۆی مەروماڵاتی ئەم ساڵی سانجەقی سلێمانیە نەماوە

بۆ جەنابی ئەفەندم
بە ووتەی یەکەی چوارەمی فەرمانگەی هەواڵگری گشتی نووسراوی ٧ کانوونی یەکەم ١٣٢٧ ژمارەی گشتی ٥١٨ و ژمارەی دۆسیە ٤٩٥٣٥ وەڵامی نەزارەتپەناهیە، لە رسوماتی مەروماڵاتی ئەمساڵی قەزاکانی سلێمانی و بازیان و شەهربازار پاشکۆی یەك رۆژیشی نەماوە، هەمووی بە تەواوەتی وەرگیراوە، هەروەها پاشکۆی قەزاکانی کەلعەنبەر و مەعمورە لە ئەنجامی چاودێریەوە لە شوێنەکانی خۆیان بە گوێرەی ئەو ئاماژانەی کە وەرگیراوە، لە کانوونی یەکەم پاشکۆی داهاتەکان بە تەواوەتی وەرگیرا، هەروەها رسوماتی مەروماڵاتەکەش پاشکۆی یەك رۆژیشی نەما، بە وەڵام بە موتەسەرفیەتی سلێمانیە راگەیەندراوە، هەروەها ئەو وەڵامەی لە ناوچەکانی تریش وەردەگیرێت، بە سەروو راگەیەندراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٩ رەبیعی یەکەم ١٣٣٠ و ١٤ شوبات ١٣٢٧.
تاهیر والی موسڵ




عدلیه و مذاهب نظارتی
سجل احوال مأمورین مدیریتی
عدد
٦١٠

خلاصه [١]

[١] بو خلاصه‌نك یازیله‌جق جوابنامه بالاسنه عیناً نقل و سجل مأمورین مدیریتی و تاریخ و نومرولرك ذکر و تصریحی تمنی اولنور



BEO.004142.310648.004

| BEO. | 004142.310648 | 22 زيلحيجه 1330 |
|---|---|---|

نەزارەتی دادوەری و مەزهەب
بەڕێوەبەرایەتی تۆماری فەرمانبەران
ژمارە ٦١٠
ڕاگەیەندراوی بەندەمانە
لە قەزای بازیان لە دادگای سەرەتایی وەکو باش کیتابەت کاری کردووە بۆ خانەنشین کردنی لە نەزارەتی دارایی جەلیلە ئاماژەی پێکراوە، محەمەد ئەفەندی ساڵی ٦٥ تێپەڕاندووە، بەڵام ماوەی خزمەتی ٣٠ ساڵی خایاندووە، ئەمڕۆ بە تێڕوانین لە بەکارهێنانی، لە شورای دەوڵەت بە بڕیاری ٧ مایس ١٣٢٧ ناوبراو لە ئەنجوومەنی تایبەتی بڕیکارەکان بڕیاری درێژکردنەوەی کارەکەی دەرچووە، لە نەزارەتی ناوهاتوو لە وەڵامدا لەگەڵ نوێنەر نووسراوی مێژووی ٧ تشرینی یەکەم ١٣٢٨ ژمارە ٥٦ ئاماژەی پێکراوە، هەروەها دانەیەك لە وەرگێردراوی باری کەسێتی کۆپی کراوە، یەك وێنەی پەسەند کراوی پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی و بۆ کارەکەش فەرمانی جەلیلەی جەنابی سەدارەتپەناهی هەیە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٢ زیلحیجە ١٣٣٠ و لە ١٩ تشرینی دووەم ١٣٢٨.
ڕاوێژکار بە ناوی نازری دادوەری

داخليه نظارتى

OSMANLI ARŞİVİ
DH.İD
127 | 13 | 13

2vrk (1shf bos)

| 21 شەعبان 1331 | 00127.00013 | DH.ID. |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی پۆستە و تەلەگراف و تەلەفۆنی جەلیلە
٢٣ حوزەیران ١٣٢٩
٢١ شەعبان ١٣٣١
مێژووی ٢٩ مایس ١٣٢٩ ژمارە ٧٦٤١/١٥٨٩ وەڵامی نووسراوی نەزارەتپەناهیە لە نێوان کەرکوك و چەمچەماڵ تێلی تەلەگراف دزراوە، ئەوانەی دزیویانە دەستگیرکراون، تێلە دزراوەکانیش گەڕێندراونەتەوە، لەسەر ئاماژەی موتەسەرفی کەرکووك بە میهرەبانیەوە هەروەها لە وەڵامدا بە ویلایەتی موسڵ راگەیەندراوە.

ML.EEM.01029.00029.008

<table>
<tr><td>ML.EEM.</td><td>01029.00029</td><td>25 شەعبان 1331</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ دەفتەرداری موسڵ<br>تەلەگراف<br>١٧ تەمموز ١٣٢٩<br>مولك<br>لە ناو قەزای بازیان سەبارەت بە نیشتەجێ کردنی حەمە خان لە زەوییەکانی بازیان نووسراوەکانی ١٤ نیسان ١٣٢٩ ژمارە ٢٣/٧٢٨ یەکسەر وەڵامەکەی بدرێتەوە.</td></tr>
</table>




<table>
<tr><td>DH.SN.THR.</td><td>00049.00011</td><td>19 سەفەر 1332</td></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی موسڵ<br>ژمارە ١٣٧<br>لە بەڕێوەبەرایەتی کارگێری گشتی تۆماری ناسنامەی جەلیلە بۆ لایەنی جەنابی سەدری ئەعزەم<br>بۆ جەنابی ئەفەندم<br>ئەم ساڵە هەژمار کراوە و ڕێکخراوە، لە خشتەی ئامارەکان لە سانجەقی موسڵ لە قەزای دهۆك سێیەم مانگ و لە قەزای شەهربازاری سلێمانیە یەکەم و دووەم مانگ هەروەها لە قەزای بازیانیش سەر بە سلێمانیە یەکەم و دووەم و سێیەم واتە خشتەی سێ مانگ بە شەش پارچە ئەمجارە پێشکەش کراوە، وێنەیەکیشی بەستراوەتەوە، دوای دڵنیابوون و دووپاتکردنەوە هێشتا لە سلێمانیە نەهاتووە، ئەمجارە بۆ چوارەم جار دووپاتکراوەتەوە، لە کاتی هاتنی خشتەکانی تر پێشکەش کردنی بە ئاسایی بینراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٤ کانوونی دووەم ١٣٢٩.<br>بەڕێوەبەری ناسنامەی موسڵ</td></tr>
</table>




| DH.ID. | 00183.1.00034 | 10 سەفەر 1332 |
|---|---|---|
| ویلایەتی موسڵ<br>قەڵەمی نووسین<br>ژمارە<br>٢٤٧ تایبەتی<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>بۆ جەنابی دەوڵەت<br>سەر بە قەزای کەرکووك و لە شارۆچکە پێنج کاتژمێر دووره، دانیشتووانەکەی لە هۆزی شوان پێکهاتوون، رسوماتی مەروماڵاتی گوندەکانی بنە سیدان، کورکەیی، حەساتی، جەلیفە، گۆران و عومەر مەندان سەر بە قەزای بازیانی سلێمانییە، هەروەها داهاتی دە یەکیشی بۆ لیوای کەرکووکە، جگە لەوە مامەڵەی سەربازیشی سەر بە ناحیەی شوانە، بەستراوەتەوە بە فەرمانگەی تابوری رەدیف، بۆ مامەڵەیەکی رێکخراو گوندەکانی ناوبراو حەواڵەی ناحیەی شوانی سەر بە کەرکووك بکرێن و بەم ناحیەیە ببەسترێتەوە، بۆ ئەمەش بە بریاری ئەنجوومەنی گشتی ویلایەت چۆنیەتی جێبەجێ کردنی پەیوەندیداران ئاگادار کراونەتەوە، پەلەش کراوە لە راگەیاندنی زانیاریەکان، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٠ سەفەر ١٣٣٢ و لە ٢٥ کانوونی یەکەم ١٣٢٩.<br>والی موسڵ | | |




داخلیه نظارتی

١٧٠٨

489/37

i.TAL 1332/S-37

İ.TAL.00489.00037.001

| I.TAL. | 00489.00037 | 2 سەفەر 1332 |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
قەڵەمی تایبەت
١٧٠٨
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
راگەیەندراوی بەندەتانە

لـە گرتووخانـەی سـلێمانیە، چەتـەی نـاودار مەحمـود کە سـزای لـە سـێدارەدانی بۆ دەرچـووە لە زینـدان رایکـردووە، دواتـر دەسـتگیرکراوەتەوە، هەروەهـا قائیمقامـی قـەزای بازیـان رەسـول ئاغـا لەگـەڵ هەمەوەنـدەکان نیشـتەجێیە و زیـاد لـە پێویسـت ئاسایشـی بەرقـەرار کـردووە، بەهـۆی خزمەتەکانـی کـە کردوویەتـی، بـۆ پاداشـتکردنی وەکـو رێزلێنـان، لـە پلـەی چـوارەم، نیشـانی مەجیـدی نیشـانی لـە سـەر ئامـاژەی موتەسـەرفیەتی سـلێمانیە لـە ویلایەتـی موسـڵ راگەیەنـدراوە، هەروەهـا بـە تێروانیـن لـە خزمەتەکانـی ناوبـراو رێـزی لـێ دەگیرێت، بـۆ جێبەجـێ کردنی بۆ سـەرووە، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ٢ سـەفەر ١٣٣٢ و لـە ١٩ کانوونـی یەکـەم ١٣٢٩.

نازری ناوەخۆ

BEO.004238.317830.002

| BEO. | 004238.317830 | 3 موحەررەم 1332 |
| --- | --- | --- |

نەزارەتی دارایی
بەڕێوەبەرایەتی مولکی میری
قەڵەمی دووەم
٤٧٣٥ گشتی
٦٧ تایبەتی
گونجاو نییە حەمە خان لە قەزای بازیان نیشتەجێ بکرێت

بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
ڕاگەیەندراوی بەندەمانە

ژمارەی تایبەتی ٢١ لە مێژووی ١ مایس ١٣٢٩ نوسراوی هاوپێچی بۆ دەسەڵاتمانە، لە موسڵ لە ناو قەزای بازیان، لە مولکی میری هیچ زەوییەکی بەتاڵ نییە، تا حەمە خان فەرمانبەری کارگێری مولکیەی بانە و دارودەستەکەی تێدا نیشتەجێ بن، بە تێروانین لە دەفتەری زەوی و زاری بەتاڵ لە بازیان زەوی نەدۆزراوەتەوە، هەروەها لە قەزای ناهاتوو ناحیەی سەنگاو بە تۆمار ئەو گوندانەی لە زەوی نیشتەجێ بینراوە، لەلایەن هۆزەکانی جافەوە داگیرکراوە، لە کاتی ڕێگریکردن لە ئەوانە دەتوانرێت حەمە خان لەوێ نیشتەجێ بکرێت، ئەگەرچی ئەوە بە بەڕێوەبەری دارایی قەزا ڕاگەیەندراوە، زەوی و زاری ناحیەی سەنگاو هەر لە کۆنەوە شوێنی هاتووچۆ و نیشتەجێ بوونی هۆزی جاف بووە، بۆیە دەرهێنانی هۆزی ناوهاتوو لەو ناوچەیە دروست نییە، دەرکەوتووە کارێکی باش نییە، بە گوێرەی وەڵامی ئاماژەی پێشوو ئەمجارە لە دەفتەرداری موسڵ نووسراو هاتووە و ڕاگەیەندراوە، بەم شێوەیەش ڕاگەیەندراوە ناوبراو لە شوێنێکی تر نیشتەجێ بکرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

لە ٣ موحەررەم ١٣٣٢ و لە ٢٠ تشرینی دووەم ١٣٢٩
نازری دارایی



DH.İ.UM.EK.00006.00078.001

| DH.I.UM.EK. | 00006.00078 | 13 رەبیعی کۆتایی 1333 |
| --- | --- | --- |

بۆ ناوەخۆی جەلیلە
هاوپێچ ٧ شوبات ١٣٣٠، لە مەرکەزی قەزا ٤٢٧٠٠ قیە جۆ حازرە، هەروەها لە بازیان ٤٣٥٩ قیە گەنم و لە ٢٢٦٥٠ قیە گەنم ٤٥٦٧ قیە گەنم بۆ کارگێری سەربازی لە مێژووی جیاوازدا رەوانی مەرکەز کرا، لە ناحیەی سەنگاویشدا ١٢٥٠٠ قیە جۆ هەیە، لە موتەسەرفی سلێمانیە راگەیەندراوە.
١٥ شوبات ١٣٣٠




موصل ولایتی سلیمانیه سنجاغی بازیان قضاسی حبسخانه‌سنك اوچنجی درت آیلق یوقلمه جدولیدر

| | محکومینك مقداری | | | ملاحظات | موقوفینك مقداری | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ذکور | اناث | یکون | | ذکور | اناث | یکون |
| جنایات | . | . | . | | ٢ | . | ٢ |
| جنحه | . | . | . | | | | |
| قباحت | . | . | . | | | | |
| یکون | . | . | . | | ٢ | . | ٢ |

بازیان قضاسی حبسخانه‌سنك ۱۳۳۰ سنه‌سی اوچنجی درت آیلق یوقلمه‌سی [illegible] ایکی موقوف محبوسك موجود بولندیغی الیوم بالمشاهده شرحه تحریر قلندی [illegible]

مدعی عمومی معاونی وکیلی — بازیان قائمقامی



DH.MB.HPS.M.00021.00011.006

| 17 ڕەجەب 1333 | 00021.00011 | DH.MB.HPS.M. |
|---|---|---|
| لە ویلایەتی موسڵ سانجەقی سلێمانیە لە گرتووخانەی قەزای بازیان بۆ سێیەم جار خشتەی چوار مانگی گرتووخانەیە<br><br>تاوان: ٢ پیاو<br>گرتووخانەی قەزای بازیان ساڵی ١٣٣٠ بۆ سێیەم جار، خشتەی ووردبینی چوار مانگی ڕێکخراوە، لە کاری ئەم خشتەیە نیشان دراوە، تەنیا دوو دەستبەسەر زیندانی کراون، لە ١ مارت ١٣٣١.<br>بریکاری یاریدەدەری داواکاری گشتی<br>قائیمقامیبازیان | | |




| DH.MB.HPS. | 00029.00058 | 24 زیلحیجە 1333 |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی نووسین
٢١٢ تایبەتی
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
پوختە: بۆ قۆناغی حکوومەت لە بازیان قۆناغێك بە کرێ گیراوە

بۆ جەنابی نازری بەگ
قەزای بازیان سەر بە سلێمانیە، لەبەر ئەوەی قۆناغی حکوومەتی تێدا نییە، بۆ نیشتەجێ بوونی حکوومەت مانگانە بە شوێنگرەوەی ٥٢ قوروش پێویستە خانەیەك بە کرێ بگیرێت، لە ئەیلوولەوە کرێی شەش مانگ دەکاتە ٣١٢ قوروش داواکراوە هاوکار بن بۆ حەواڵە کردنی، بە ووتەی ژمێریاری ویلایەت رادەگەیەندرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٤ زیلحیجە ١٣٣٣ و لە ٢٠ تشرینی یەکەم ١٣٣١.
حەیدەر والی موسڵ


OSMANLI ARŞİVİ
DH.EUM. 2.Şb
18 | 24

18/24/1

<table>
<tr><td>DH.EUM.2.Şb.</td><td>00018.00024</td><td>24 رەبیعی کۆتایی 1334</td></tr>
<tr><td colspan="3">لە موسڵ دەرچووە<br>لە قەزای بازیان لە کاتی دەرهێنانی گۆگرد ١٢ کەس ژیانیان لەدەست داوە، ئەمەش بە ئاماژە پێکردنی ناوەخۆ ڕاگەیەندراوە.<br>حەیدەر والی</td></tr>
</table>


T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA)

بازیانه قضاسی مرکزی چمچمال حبسخانه سنك ايكنجی درت آيدن بو طرفه حبس بالاجرا محبوس وموقوف ومحكوم بولنديغی مبين اشبو رايور تنظيم وتقديم قلندی

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MB.HPS.M
26 | 39 | 2

DH.MB.HPS.M.00026.00039.002

| 16 زیلحیجە 1334 | 00026.00039 | DH.MB.HPS.M. |
|---|---|---|

گرتووخانەی چەمچەماڵ کە مەرکەزەکەی قەزای بازیانە، لە ماوەی چوار مانگی دووەم جار، زیندان و دەست بەسەر نەبووە، بۆ ئەم کارەش راپۆرت رێکخراوە و پێشکەش کرا.

١ تشرینی دووەم ١٣٣٢
محەمەد .... قوماندانی ژاندارمە
مستەفا فازڵ قائیمقامی بازیان



DH.MB.HPS.M.00027.00026.002



DH.MB.HPS.M.00027.00026.003

| DH.MB.HPS.M. | 00027.00026 | 9 جەمادی یەکەم 1334 |
|---|---|---|

- لە ویلایەتی موسڵ سانجەقی سلێمانیە گرتووخانەی قەزای بازیان هەژماری خشتەی چوار مانگی سێیەم جار، ساڵی ١٣٣١

تاوان/ پیاو: ٤ دەستبەسەر

ساڵی ١٣٣١ هەژماری چوار مانگی سێیەم جار، ئەمرۆ جێبەجێ کراوە، لە خشتەیەك ڕێکخراوە.

لە ١ مارت ١٣٣٢

بریکاری قائیمقامی بازیان قوماندانی ژاندارمە

- ویلایەتی موسڵ

قەڵەمی نووسین

ژمارە

٨ تایبەتی

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

بۆ جەنابی نازری بەڕێز

هاوپێچی نوسراوی ٥ مارت ١٣٣٢ ژمارە ٦، شارۆچکەی سلێمانیە و قەزای بازیان گرتووخانەکانیان بۆ ساڵی ١٣٣١ بۆ سێیەم جار خشتەی چوار مانگ لە موتەسەرفیەتی سلێمانیە دوو پارچە خشتە پێشکەش کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢١ جەمادی یەکەم ١٣٣٤ و لە ١٢ مارت ١٣٣٢.

نامەی بریکاری والی موسڵ



باب عالی
داخلیه نظارتی
مأمورین و سجل احوال مدیریتی
عدد
٢١٦٩٨
١١١

حضور عالی جناب صدارتپناهی

DUIT 44/13

2

İ.DUİT.00044

| | | |
|---|---|---|
| I.DUIT. | 00044.000013 | 10 جەمادی کۆتایی 1334 |

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی ناسنامەی کەسێتی و فەرمانبەران
ژمارە ٢١٦٩٨
١١١
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
ڕاگەیەندراوی بەندەتانە
قائیمقامیەتی قەزای بازیان شوێنەکەی بە تاڵە، یەکێك لە دەرچووانی مەکتەبی مولکیە، بەڕێوەبەری ناحیەی حەکیم خان، مستەفا ئەفەندی، لە چینی سێیەم بە مووچەی قائیمقامیەت دامەزراوە، لە ئەنجوومەنی بەڕێوەبەر بڕیاری لەسەر دراوە، لیستی فەرمانی پاشاش پێشکەش کراوە، جێبەجێ کردنی بۆ لایەنی سەرووە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
١٠ جەمادی کۆتایی ١٣٣٤ و لە ٣١ مارت ١٣٣٢
نازری ناوەخۆ

| .DH.MB.HPS | 00060.00078 | 26 زیلحیجە 1334 |
|---|---|---|

ژمارە ١/٢١ لە مێژووی ٥ مارت ١٣٣٢ کرێی شەش مانگی یەکەمی ئەم ساڵی قۆناغی حکوومەت لە حەواڵەنامە نوسراوەتەوە
مانگانە
٥٣ کرێی قۆناغی حکوومەت لە مزوری
١٩ کرێی قۆناغی حکوومەت لە عەقرە
٣٧,٢٠ کرێی قۆناغی حکوومەت لە کەرکووك
١٨٥ کرێی قۆناغی حکوومەت لە سلێمانیە
٢٠ کرێی قۆناغی حکوومەت لە کۆپری
٥٧ کرێی قۆناغی حکوومەت لە مادیەت
١٢٥ کرێی قۆناغی حکوومەت لە قەرەتەپپە
٤٠ کرێی قۆناغی حکوومەت لە دهۆك
١٩ کرێی قۆناغی حکوومەت لە بەرواری باڵا
١٩ کرێی قۆناغی حکوومەت لە بەرواری ژێر
١٩ کرێی قۆناغی حکوومەت لە ....
١٩ کرێی قۆناغی حکوومەت لە ریکان
٣٨ کرێی قۆناغی حکوومەت لە بازیان
١٧٠ کرێی قۆناغی حکوومەت لە جۆلەمێرگ
٢٩ کرێی قۆناغی حکوومەت لە کوار
١٥٠ کرێی قۆناغی حکوومەت لە شەمدینان
٩٩٩,٢٠
٥٩٩٧ بری دەرماڵەی شەش مانگی یەکەم
٤٠٧٧,٢٠ بری ئەو دەرماڵەیەی لەگەڵ حەواڵەنامەی ٥ مارت ١٣٣٢ ژمارە ١/٢١ هاتووە، ١٩١٩,٢٠ دەرماڵەی کەمکراوە

ژمارە ١/٢١ لە مێژووی ٥ مارت ١٣٣٢ کرێی شەش مانگی یەکەمی ئەم ساڵی گرتووخانە لە حەواڵەنامە نوسراوەتەوە
مانگانە
١٠٠ کرێی گرتووخانەی ئافرەتانی مەرکەزی ویلایەت
١٠٢,٢٤ کرێی شوێنی پارێزگارانی ژاندارمە لە گرتووخانەی مەرکەزی ویلایەت
٥٠ کرێی گرتووخانەی کەرکووك
٢٥ کرێی گرتووخانەی پیاوانی کەرکووك
٥٠ کرێی گرتووخانەی ئافرەتانی سلێمانی
٥٨ کرێی گرتووخانەی رواندز
١٩ کرێی گرتووخانەی هەولێر
٤٠ کرێی گرتووخانەی جۆلەمێرگ
٤٤٤,٢٤
٢٦٦٧,٢٤ بری دەرماڵەی شەش مانگی یەکەم
٢٥٦٥ بری ئەو دەرماڵەیەی لەگەڵ حەواڵەنامەی ٥ مارت ١٣٣٢ ژمارە ١/٢١ هاتووە، ١٠٢,٢٤ دەرماڵەی کەمکراوە
لە ١٤ تشرینی دووەم ١٣٣٢


ML.EEM.01193.00009.003

| ML.EEM. | 01193.00009 | 3 شەعبان 1334 |
|---|---|---|

فەرمانگەی مولکی میری موسڵ
ژمارە
٣٦٧٥ گشتی
٢٠٩ تایبەتی
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
بۆ جەنابی دەوڵەت

بە ووتەی بەڕێوەبەرایەتی مولکی میری لە قەڵەمی یەکەم فەرماننامەی نەزارەتپەناهی وەڵامی داواکاریە کە لە ٣٠ نیسان ١٣٣٢ ژمارە ٢٢/٨٠٠ هاتووە، لە کاتی لێکۆڵینەوە لە قەزای بازیان گوندی چەمچەماڵ قشلە لەوێ نییە، بۆ نیشتەجێ کردنی ژاندارمەش، بە هاوکاری قشلەیەك دروست بکرێت، بەم شێوەیە دەبێتە مولکی میری، بۆیە بە ناوی خەزینەی جەلیلەی دارایی سەنەدەکانی بردراوە، لە کاتی لێکۆڵینەوە دەرکەوتووە لە دەفتەر هەڵەی تێدا بووە، ئەمجارە بە مەبەستی گۆڕین و راستکردنەوەی دەفتەرەکە، دەفتەر و سەنەدەکان بەیەکەوە پێشکەشی سەروو کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

لە ٣ شەعبان ١٣٣٤ و لە ٢٢ مایس ١٣٣٢
بەڕێوەبەری مولکی میری موسڵ
دەفتەرداری موسڵ

| BEO. | 004409.330627 | 14 جەمادی کۆتایی 1334 |
| --- | --- | --- |

١٤ جەمادی کۆتایی ١٣٣٤
٤ نیسان ١٣٣٢
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

مێـژووی ٣١ مـارت ١٣٣٢ ژمـارە ١١١ وەڵامـی نـووسراوی سـەرووە: بـۆ قائیمقامیەتـی قـەزای بازیـان مسـتەفا ئەفەنـدی بەرێوەبـەری ناحیـەی حەکیـم خـان دادەمەزرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە بـە رەزامەنـدی فەرمانـی پاشـای جەنابـی پاشـا فەرموویەتـی، وێنـەی پەسـەندکراوی بـۆ لایەنـی دەوڵـەت نێـردراوە.




| DH.EUM.2.Şb. | 00043.00047 | 14 موحەررەم 1335 |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی نوسین
١٩٤ تایبەتی
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
بۆ جەنابی نازر بەگ

لە ناو سانجەقی سلێمانیە قەزای بازیان لە گوندی کولمکوە، بۆ دەستگیرکردنی تاوانیاری ئەو تاوانەی کە ئەنجام دراوە لە تابورەکانی کەرکوك و سلێمانیە بە تێکەڵی مەفرەزەیەك پێك هێنراوە و بۆ ئابڵوقەدانی گوندەکە ڕۆیشتوون، لە کاتی گەیشتن ڕووبەڕووبوونەوە ڕووی داوە، حەوت کاتژمێر بەردەوام بووە، هەروەها یەك مایین و یەك ئێستری ژاندارمەکان برینداد بووە، جگە لەوە بۆ دوورخستنەوەی بوێری کەرانیش فەرمان دراوە هێزەکە زیاد بکرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٤ موحەررەم ١٣٣٥ و لە ٢٧ تشرینی یەکەم ١٣٣٢.
حەیدەر والی موسڵ


باب عالی
داخلیه نظارتی
مأمورین و سجل احوال مدیریتی
عدد
٢٥١٨٥
٧٦٣

DUIT 45/5

I.DUİT.00045

| I.DUIT. | 00045.000005 | 15 سەفەر 1335 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی تۆماری کەسێتی و فەرمانبەران
ژمارە ٢٥١٨٥
٧٦٣
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
ڕاگەیەندراوی بەندەتان
شوێنی قائیمقامیەتی قەزای عەقەبە بەتاڵە، داواکراوە یەکێك لەوانە لە دەرچووانی مەکتەبی مولکیە، لە نەزارەتی دارایی بەڕێوەبەرایەتی گشتی هاتووەکان لە یەکەی سێیەم خالد عیزەت دابمەزرێت، هەروەها بۆ قائیمقامیەتی بازیان، بەڕێوەبەری ناحیەی تاتارەکان موحسین بەگ لە بەڕێوەبەری مەکتەبی ناوهاتوو دەرچووە، بە مووچەی چینی سێیەم دادەمەزرێت، بە بڕیاری بەڕێوەبەرایەتی ئەنجوومەن لیستی فەرمانی پاشا پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردن، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٥ سەفەر ١٣٣٥ و لە ٢٨ تشرینی دووەم ١٣٣٢.
نازری ناوەخۆ


داخلیه نظارتی

DUIT 45/19

İ.DUİT.00045

| 13 ڕەبیعی یەکەم 1335 | 00045.000019 | I.DUIT. |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی تۆماری کەسێتی و فەرمانبەران
ژمارە ٨٤٢/٢٥٥٩١
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
ڕاگەیەندراوی بەندەتانە

شوێنی قائیمقامی قەزای بەرولسەبع بەتاڵە، لە قائیمقامیەتی قەزای ڕەشادیە جیابۆتەوە، نیازی، بە تاقیکردنەوە خۆی سەلماندووە، بۆیە ئەو دابنرێت، هەروەها لە قائیمقامیەتی قەزای بازیان موحسین بەگ دامەزراوە، بەڵام داوای لێبووردنی کردووە، بۆیە بۆ قائیمقامیەتی قەزای ناوهاتوو ئیسماعیل حەقی بەگ بەڕێوەبەری ناحیەی بەرکی ئەویش بە تاقیکردنەوە ناسنامەی خۆی دەرخستووە، بە مووچەی چینی سێیەم کە تا ئێستا بە مانگ و ڕۆژ نوری بەگ و دەمیر ئاسف بەگ مووچەی قائیمقامیەت وەردەگرن، بەم مووچەیە ئەرکەکەیان بگوازرێتەوە، بە بڕیاری ئەنجوومەنی بەڕێوەبەرایەتی پەسەند کراوە و لیستی فەرمانی پاشاش پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردن، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ١٣ ڕەبیعی یەکەم ١٣٣٥ و لە ٢٥ کانوونی یەکەم ١٣٣٢
نازری ناوەخۆ




| DH. ŞFR. | 00083.00180 | 16 رەبیعی کۆتایی 1336 |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی تۆماری کەسێتی و فەرمانبەران
بۆ ویلایەتی موسڵ
شیفرە
لە ٦ کانوونی دووەم ١٣٣٤ شیفرە، لە ناو بەتلیس گۆڕینەوەی قائیمقامەکان گونجاو نییە، خەلیف ئەفەندی بۆ مەعمورە بگوازرێتەوە، بۆ کۆی سانجەقیش قائیمقامی پێشووی زاخۆ مەسعود ئەفەندی دادەمەزرێت، لەم بارەیەوە خوێندنەوەتان لە دابینکراوەکانی قائیمقامیەت ئاقچەی دەست بەسەرکراو نییە، لەبەر ئەوەی فەوزی بەگ لە چینی یەکەمە مووچەی بریکاری پێ نادرێت، بە دامەزراندنی لە ناحیەیەك وەکو بەڕێوەبەر، بە وەکالەت لە قائیمقامیەتی بازیان دادەمەزرێت، مونیر بەگیش بە مووچەی ٢٠٠٠ قوروش لە بەڕێوەبەرایەتی تەلەعفەر دادەمەزرێت، بۆ قائیمقامیەتی سنجاریش تا کەسێکی شیاو دەدۆزرێتەوە، ئەوا بە وەکیلێکی گونجاوی لێهاتوو بەڕێوەببردرێت، سوڵتان بەگ قائیمقامی کەلعەنبەریش بەهۆی بوونی سکالا بە پەسەندکردن و پەسند نەکردنی سکالاکان، پێویستە روون کردنەوە پێویست بدرێت لەسەر ئەو ناوبانگە خراپەی کە هەیەتی، لە ٢٩ کانوونی دووەم ١٣٣٤.
بە ناوی وەکیلی نازر




باب عالی

داخلیه نظارتی

مأموریین و سجل احوال مدیریتی

عدد

موصل ولایتنه شفره



DH.ŞFR.00085.00006.001

<table>
<tr><td>DH. ŞFR.</td><td>00085.00006</td><td>19 جەمادی یەکەم 1336</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>بەڕێوەبەرایەتی ناسنامە و تۆماری فەرمانبەران<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>فەرمانبەرانی ٣٩ لە ١٢ شوبات ١٣٣٤ شیفرە، مۆڵەت درا بە گواستنەوەی ئەمین بەگ بۆ کەلعەنبەر، محەمەد ئەمینیش بە گواستنەوەی بۆ شوێنەکەی تر، بۆ مەعمورە و بازیانیش کەسانێکی گونجاو دادەمەزرێن و ئامادەن، لە ٢ مارت ١٣٣٤.<br>عبدالخضر بە ناوی نازر</td></tr>
</table>




باب عالی
داخلیه نظارتی
مأمورین و سجل احوال مدیریتی
عدد
عمومی
خصوصی

موصل ولایتنه
شیفره



DH.ŞFR.00086.00231.001

<table>
<tr><th>DH. ŞFR.</th><th>00086.00231</th><th>12 ڕەجەب 1336</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>بەڕێوەبەرایەتی تۆماری ناسنامە و فەرمانبەران<br>٣٢٥٧٩ گشتی<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>شیفرەی ٦ نیسان ١٣٣٤، مدحەت ئەفەندی لە ئەرکی قوماندانیەتی ژاندارمە دەمێنێتەوە و لە ژاندارمەش دەست لە کار دەکێشێتەوە، بە سێ یەکی مووچە لە قائیمقامیەتی بازیان بە وەکالەت و بە شێوەی کاتی دەست بە کار دەبێت.<br>لە ٢٣ نیسان ١٣٣٤<br>عبدالخضر بە ناوی نازر</td></tr>
</table>




DH.MB.HPS.00094.00004.002

<table>
<tr><td>DH.MB.HPS.</td><td>00094.00004</td><td>1 جەمادی یەکەم 1336</td></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی موسڵ<br>قەڵەمی نووسین<br>٣٩<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>راگەیەندراوی بەندەتانە<br>پێویست کراوە و پێویستیش بووە، بۆیە لە ساڵی ١٣٣٠ سەرەتای مانگی تشرینی دووەم لە قەزای بازیان گرتووخانەی ئافرەتان دامەزراوە، مانگانە ٥٠ قوروش بەرامبەر بە کرێی خانە و مانگانە ١٠٠ قوروش بۆ مووچەی پاسەوانەکان حەواڵەنامە نێردراوە و داوای هاوکاری کراوە، بە ئاماژەی موتەسەرفی سلێمانی و ووتەی ژمێریاری ویلایەت راگەیەندراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>١ جەمادی یەکەم ١٣٣٦ و ١٣ شوبات ١٣٣٤<br>والی موسڵ</td></tr>
</table>

تلغرافنامه

دولت عثمانیه

DH.ŞFR. 579/45

DH.ŞFR.00579.00045.001

| 24 ڕەجەب 1336 | 00579.00045 | DH. ŞFR. |
|---|---|---|

شیفرە لە موسڵەوە دەرچووە
لە ١٣٣٤/٣/٢ ژمارە ٤ قەزاکانی بازیان و مەعمورە و شەهربازار لە کۆنەوە شوێنی گرنگ بوونە، ئەو هۆزانەی کە لەوێن، خەڵکەکەی کەللە رەقن، بۆیە ئەو کەسانەی لەو ناوچانە وەکو قائیمقام دادەمەزرێن، دەبێ بوێر و لە بەرامبەر بارودۆخەوە ڕێکوپێك بن و خەڵکی ئەنادۆڵ و روم بن.
مەمدوح والی

TELEGRAMME

ADMINISTRATION DES TELEGRAPHES DE L'EMPIRE OTTOMAN

DH-ŞFR 581/59

DH.ŞFR.00581.00059.001

| 24 جەمادی کۆتایی 1336 | 00581.00059 | DH. ŞFR. |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆ

لەبەر گرنگی شوێنی بازیان، بەڕێوەبەری ناحیەی پێنجوین بە وەکالەت لە قائیمقامیەتی بازیان دابنرێت، بەڵام لەبەر سنووری ناحیەی ناوهاتوو پێویستە بەڕێوەبەر هەبێت، ئەمەش لەلایەنی سەربازی خۆچێی نووسراوەتەوە، مەدحەت ئەفەندی دامەزراندنی لە قائیمقامیەتی بازیان بە گوێرەی لاری بوون و لاری نەبوونی راگەیەندراوی بەندەمانە، بەپەلە جێبەجێ بکرێت.

مەمدوح والی موسڵ




BEO.004512.338327.002

| BEO. | 004512.338327 | 4 رەجەب 1336 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی تۆماری ناسنامە و فەرمانبەران
٣٢٤٢٧ گشتی
٣٨٧ تایبەتی
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
پوختە: بۆ قائیمقامیەتی قەزای بازیان بە وەکالەت یوزباشی ئەحمەد مەدحەت ئەفەندی دامەزراوە

ڕاگەیەندراوی بەندەتانە
بە پێویست زانراوە و لەبەر گرنگیەکەی بە وەکالەت لە قائیمقامیەتی قەزای بازیان دامەزراوە، یوزباشی ئەحمەد مەدحەت ئەفەندی کە سەر بە ئاڵای ژاندارمەیە، بە سێ یەکی مووچەی وەکالەت مووچەکەی پێ دەدرێت، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە پێویست بە هاوکاری سەروو دەکات، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
٤ ڕەجەب ١٣٣٦ و لە ١٦ نیسان ١٣٣٤
ڕاوێژکار بە ناوی نازری ناوەخۆ